کۆمەڵە چیرۆکی

# جەستەیەکی خۆڵاوی
# بە سەر قاڵیچەی سولەیمانەوە

ڕزگار لوتفی

١٣٩١



لطفی، محمد رزگار، ۱۳٥٤
**جەستەیەکی خۆڵاوی بە سەر قاڵیچەی سولەیمانەوە**
داستان‌های کُردی - قرن ١٤

ISBN: 978-600-5647-48-8

فهرست‌نویسی بر اساس اطلاعات فیپا
موضوع: مجموعه داستان کردی
۱۳۹۱ ٦ل۷٤٥س/۳۲٥٦ RIP ۸فا۹/۲۳
کتابخانەی ملی ایران: ۳۰۸۰۳٦۷


کۆمەڵە چیرۆکی

**جەستەیەکی خۆڵاوی بە سەر قاڵیچەی سولەیمانەوە**

ڕزگار لوتفی

دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆک: ئازاد سورخی

ئەژمار: ۱۰۰۰ دانە

نرخ: ٥۰۰۰ تمەن

ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی گوتار

سەقز، شەقامی ۲۲ی بەهمەن (پل هوایی)

تەلەفوون: ۰۸۷٤ - ۳۲۲۷۰۳۰



# پێڕست

■

# کۆچیرۆکێک لە گەمارۆی میتۆلۆژیا و فولکلۆردا

**فەرۆخ قادر**

■

چیرۆک لە فۆڕمی نوێی خۆیدا لە راستیدا بە جۆرێک جێ هێشتنی جۆری گێڕانەوی کۆن و فەزا کۆنەکان بوو. چیرۆک لە فۆڕمی مۆدێڕنی خۆیدا بە گەڕانەوە یاخود هەڵبژاردنی بابەتە کۆمەڵایەتـی، مێژوویی و دەروونییەکان هەوڵی دا بە شـێوەی هونـەری، مرۆڤ و کۆمەڵگای نـوێ و مودێڕن وێنا بکاتەوە و بـە واتایەکی تر گـەر بمانەوێ لە ترمینۆلۆژیی ئەرەسـتوو کەڵک وەرگرین و بە لاسایی کردنەوە ببێ بە ئاوێنەی باڵانمای راسـتییە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان. لەم شـێوازە نوێیەدا ئیتر بوونەوەرە ئەفسانەییەکان، دیاردە بانەکان و شوێن و کاتە نادیار و ئەزەلییەکان فەزای چیرۆک بە جێدێڵن و لە جیاتی ئەمانە ئێمە لە گەڵ بوونە زەمینییەکان و شوێن و کاتە دیارەکان رووبەڕووین. بەڵام لە سەردەمی پۆستمۆدێڕن دا و بە دەستپێشخەری نووسەرانی بەناوبانگـی جیهانـی، میتۆلۆژیا و کلتور بوونـەوە بە بابەتی هونەری گێڕانەوە و بەم شێوەیە لە رێگای ئاوێتەکردنی فۆڕمی

چیرۆک و ناوەڕۆکی میتۆلۆژیایی و فۆلکلۆری، دیاردە یاخود بوونەوەرێکی تـــر خوڵقا کە هەم مودێـــڕن دەینواند و هەم کۆن یاخود ترادیســـیۆنی. وە رزگار لوتفی لـــە زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکەکانی ئەم کۆبەرهەمەدا کەڵکی لەم شێوازە وەرگرتووە.

رەنگە سەرەڕای ئاسایی بوونی پرسیارەکە، پرسیارێکی شیاو نەبێت کە بۆچی رزگار لەم شـــێوازە کەڵکی وەرگرتووە. گەڕان بە شوێن هۆکارەکاندا هەمیشە یەکێک لە ئەستەمترین کارەکان بووە، بەتایبەت کاتێک قسە لە سەر هونەرە. چونکە لە هونەردا، شـــێوازی دەربڕین بەرگێکی یەکجار تایبەت دەپۆشێ کە تێیدا لە دالآنە هەزار ســـەرەکانی دەروونی نووسەرەوە گوزەر دەکەن و بـــەم پێیە، واقیع یاخود وێنەکان وەها دەگۆڕدرێن کە دۆزینەوەی هۆکار بۆی، یەکجار دژوار دەبێ.

بەڵام لە راستیدا ئێمە کارمان بە هۆکار نیە. رەنگە خۆشیی و شیرینی و بە مرۆڤانەتر بوونی پتری هونەر لە چاو فۆڕمەکانی تری ناسین دا ئەوە بێت کە پێش ئەوەی لە هۆکارەکان بپرسێ، لە خودی رووداوەکان دەگەڕێ و باس لەوان دەکا. ئەوســـا دواتر ئەو دەرفەتـــە بە خوێنەر دەدا کە لە فەزایەکی کراوە و هێرمنوتیکی و دیمۆکراســـیانەدا خۆی ئەگەر پێی خـــۆش بێ، راڤەیەک لە هـــۆکار یاخود هـــۆکارەکان بکا. هەڵبەت لێـــرەدا رزگار وەک هەموو ئەو نووسەرانەی کە خۆیان بە شێوازەوە خەریک کردووە، زۆر خۆ ئاســـان بە دەســـتەوە نادا، گەڕان لە فۆڕمی مودێڕن و

لە ناوەڕۆکی ترادیسیۆنی دا کە بە جۆرێک لە ڕێگای ڕووداوە هەنووکەییەکانەوە خۆی دەنوێنێتەوە، ئاسان نیە.

جا ئیزن بدەن با لە بەر بالاخانەی کۆنی ئەم پرسیارە تێپەڕین و کەمێکی تر باس لە خودی نێوەڕۆک بکەین.

رزگار بە کەڵک وەرگرتن لە میتۆلۆژیا و ئەفسانە مەزهەبییەکان و تێکەڵکردنی لە گەڵ فەنتازیای تر یاخود هەنووکە، پەیوەندی دەگرێ لە گەڵ شەڕە بە ڕواڵەت ئەزەلییەکانی وەک براکوژی، ناکۆکییەکان و سەرەڕۆییەکان و نافرمانییەکانی مرۆڤ لە گەڵ خودا، گلەیی لە بێ عەداڵەتی خودا لە بەرامبەر گەلێک و، سەرئەنجام گەڕانە دژوارەکانی مرۆڤ.

«بۆ جیلەکانی دواترا بە سەدان ساڵ بێ پشوودان، بست بە بستی ئەشکەوتەکانمان پشکنی. کون و ڕەهێڵ و قوژبنەکانیشمان جێ نەهێلا. هەدامان نەدا. شەونخوونیمان کێشا. بەلام ئاسەوارێکمان نەدۆزییەوە. چیتر پێویست بە گەڕانی ئێوە ناکا. خۆ هیلاک مەکەن و «چێو لە تاریکی مەکوتن!»»

ڕەنگە ئەم گەڕانە دژوار و لە هەمان کاتدا بێ ئاکامە بێت کە دەتوانێ بە جۆرێک براکوژی، ناکۆکییەکانی مرۆڤ لە گەڵ خودا و نەفرەت لە بێ عەداڵەتی پاساو بداتەوە و ئەو ئیزنە بە مرۆڤ بدات کە بەردەوام لە گەڵیاندا بژیت، ... ژیانێکی ئازاراوی، کە لە گەڵیا بیرکردنەوەیەکی ئەبەدی و ئەزەلیش ڕێ

دەکا. گەڕانی رزگار لێرەدا خوێنەر بیری ئەفسـانەی سـیزیف دەخاتەوە. بەڵام بـەو جیاوازییەوە کە کـۆی کاراکتێرەکان نە تەنیا لە رێگای کردەوە، بەڵکو لە رێگای وشەیشـەوە راستەوخۆ پەیامێکی خەمناک بۆ نەوەکانـی داهاتوو بەجێدێڵن. پەیامی نەگەڕان و مل کەجکردن لە ئاسـت شکستی ئەوانەی رابردوو و پەلکێشکردنی بۆ ئیستا وەک تەنیا راستیی ژیان و بوون.

رەنگە لێرەوە گەر بمانەوێ بۆ پرسیاری هۆکار کە لەوە پێش هێنامانـە ئاراوە، بگەڕێینەوە، دەبێ بڵێین کە شـایەد هۆکاری گەڕانەوە و کەڵک وەرگرتنی رزگار لە میتۆلۆژیا ئەمە بێت. لە میتۆلۆژیا و کلتوردا، وەک نێوەڕۆک، گەلێک رووداو هەن کە ئێمە بیری ئیستا و بیری تەنانەت پیش خۆشیانمان دەخەنەوە. واتە بە پەیوەندی گرتن لە گەڵ کلتور، دەگەینە دەرک و تێگەیشتنی بازنەیی لە بوون (بە پێچەوانـەی دەرکی هێڵی یاخود خەتی). تێگەیشتنێک کە دەتوانێ دوو ئاکامی بە شوێنەوە بێت: ئاکامی تەسلیم بوون بەم دەرکە یاخود هەوڵدان بۆ دەربازبوون لێی.

چیرۆکەکان لەم بارەیەوە هیچ ناڵێن. ئەمە لە راسـتیدا بۆ خوێنەر بەجێماوە.

پانزدەی دیسامبری ٢٠١٢

## جەستەیەکی خۆڵاوی بە سەر قاڵیچەی سولەیمانەوە

■

بە ســـوغرە گرتوومی. لە ڕابوردووەکەی ناگەم. لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێ، دەقا و دەق چەشنی باوە گەورە خەڵفاوە سێو خۆرەکەی سولەیمانی میرم. لە سەر گوزەشتەکەی ئەوەندەم لە سولەیمان بیستووە کە پێی گوتم:

. «لـــەو دوور دوورەوە، لـــە وڵاتی مرۆڤـــە خۆڵاویەکانەوە دێ. خۆڵ سەرتاپای جەســـتەی تەنیوە. پێلووەکانیشی بە خۆڵ ســـواغ دراوە. گوێچکەکانیشـــی لێوانلێون لە خۆڵ. بە ئاستەم دەبیستن. نابینی جل و بەرگیشی نوقمی خۆڵە؟ ڕێک چەشنی پەیکەرێکی ســـازکراو لە لمی قەراغ زەریا. کە گەیشتە لات و پێی نایە سەر پشتت، لە لاقە خۆڵاویەکانی گازندە مەکە و سەر خۆتی مەهێنە، ئەوە خۆشەویســـتی منە و ماندووێکی بە ســـەد جێ کۆڵەواری کەژە ڕێیەکی ســـەغڵەتە و جێگای مەرحەمەت و بەزەییە».

ناوچاوانێکی چەتوون و ڕدێنێکی مام ناوەندی پەشـــمینە و

بۆز، ســـیما لەڕ و لاوازەکەی نەخشاندووە. لە سەرووی بارستایی گۆناکانیەوە دوو چاوی زیت و کارتێکەر و بەسام بەدی دەکرێ. قــژ و ڕدێنی تێکهەڵکێـــش بوون و پەلکەکەی چەشـــنی بۆز مارێکی قــوڵ بە دەوری ملیا پاپۆکەی داوەتەوە. ئاشـــکرایە کـــە تەمەن دار و بە ئەزموون و بـــێ وچان و کۆڵنەدەرە. بڕیارم وابوو بێجگە سولەیمان، کەس نەتوانێ پێم ڕێخشکێنێ و سواری نەدەمێ، بەڵام بێ قسەیی ئەوم پێ ناکرێ و لە حاست فەرمانیدا ملکەج و دەســـتەمۆم. فەرمانی کەسێ کە نوێنەری خودا بووە لە ســـەر گۆی زەوی و حەدەم و حەشەم و دێو و درنج و تەنانەت پەلەوەرەکانیشـــی لـــە ڕەهێڵدا بوون، نێزیک بـــە ڕێژەی کۆی دەسەڵاتی خوداوەندی مەزن. لێم پرسی:

- ڕەنگە تۆ بەختەوەر ترین مرۆڤی سەر ڕووی دونیا بی کە توانیووتە بنیشێیتە پشتی قاڵیچەی سولەیمان و خولیای سەفەری زەمەنت بێ؟ ئەکرێ بپرسم: بەرە و کوێ؟

قسە کردنەکەم سەرنجی ڕانەکێشا، چاوێکی بە سەرتاپای کۆڵەوار و لە خۆڵ ڕاچووی خۆیدا خشـــکاندەوە و بە دڵپڕییەوە گوتی:

- بەرە و داهاتوو.

- بۆ داهاتوو؟

ڕەنگـــە تەقینـــەوەی کلْپـــەی گریانێـــک، بووبێتە تاکە پێویستیەک تا هەناوی بسرەوێ.

- لە تاو ڕابوردوو!

لە سەفەرەکانم لە گەڵ سولەیماندا بیستبووم کە «ڕابوردوو، سەکۆی هەڵدانی داهاتووە. لە سەر پێگەی ڕابوردووەوەیە کە خەونەکانی داهاتوو باڵە فڕە ئەبن. لە ڕووبەرگی ڕابوردووێکی ئەنجنەنجندا، واژۆی داهاتوویەکی زەخمار و کۆڵەوارتر دەنەخشێندرێ!»

ماوەیەکی درێژ بوو چیتر چیرۆکە دووپاتکراوەکانی سولەیمان نەیاندەبزواندم و بێ تاقەتیان کردبووم. دەرفەتێکی باش بوو مرۆڤە خۆڵاویەکە بە چیرۆکەکانی خۆیدا بچێتەوە و ڕێگای سەفەرمان کورت بکاتەوە. داوام لێ کرد پێش ئەوەی سەفەری داهاتووی دەست پێبکات، ئاوڕێ لە ڕابوردووی بدەینەوە. پێمل نەدەبوو، وەکوو ترسێ لە شوێن کەوتووێ هەیبێ، بەردەوام نکۆڵی لە گەڕانەوە دەکرد. پتر سەرنجم ڕاکێشرا تا ئەو ڕابوردووە شاراوەیەی ببینم کە نەیدەویست جارێکی دیکە بچێتەوە سەر وەختی. لە ئاکامدا و دوای ململانێیەکی دەستە و یەخە و خۆماڵیانە بە قەناعەتم گەیاند کە «شاردنەوەی ڕابوردوو، مانای کوژانەوەی فانۆس و گوم کردنی زاریچەی گەرووی داهاتووە.» لە ناچارییا ملی دا، بێ سێ و دوو لووتم وەرسووڕاند و ڕووەو ڕابوردوو و بە تەوژمەوە خۆم کردەوە بە گەرووی زەمەندا.

گەڕاینەوە بۆ ساتەوەختەکانی زوو:

دوور و نزیک لە بەرزاییەوە ڕوانیمانە ڕووبەری زەوی،

باشتر ورد بووینەوە، تەرمی مرۆڤێکمان بینی بە سەر شانی کەسێکەوە،بە هەناسکە هەناسک و ورد و هێور، بێهۆ و لە خۆڕا بە دەوری خۆیدا وەردەسووڕا، ماندوویی لە هەنگاوەکانیەوە دەچۆڕایەوە. لە سوارەکەم پرسی:

- ئەمانە کێن؟

قەتارەی وشە دەرهاتووەکانی زاری، لە قینەوە گلابوون:

- دوو برای نابرا! یەکیان ئەوی دیکەیانی داپلۆسیوە و بێ بەزەییانە کوشتوویەتی. ڕەنگە ئێستا لە شاردنەوەی تەرمەکەیدا بێ. دەستەوەستان و بێ چارەیە. هەڵگری جل و بەرگێ پڕ بە باڵای کورتە باڵای مرۆڤایەتی، پلیتە و سووتەمەنی کۆنە چرای تەم گرتووی مێژوو !

تێی نەگەیشتم، هەستم کرد برینە قووڵەکانی سەر وڕێنەیان خستووە. سەرەتاکانمان بە جێ هێشت، بە ئاقارێکدا تێپەڕین گەردەلوول و تەمتۆمانێکی گرژ بوو، چوارچێوەی خانووەکانی ئاوەدانییەکەی لە گێژەنی خۆیدا ڕاپێچ ئەدا. زات و زریقەی پۆلە مرۆیەکی ماڵ وێران بوو کە لەوبەرەوە دەکەوتە بەر گوێ. نێزیک کەوتنەوەمان کردەوەیەکی ژیرانە نەبوو. دەمزانی سوارەکەم بە خۆڵ گوێ ئاژەن بووە و گرمە و لرفەی گەردەلوولەکەش دووقاتیەتی. بە دەنگی بەرز نەڕاندم:

- ئەم خەڵکە بۆ وایان بە سەر دێ؟

ئەویش وەک ئەوەی من کەڕ بم تا توانی دەنگی بەرز

کردەوە، بە جۆرێ کە ڕەگی لاملی وەکوو کرمێکی ئەستوور هەڵماسی و کەوتە بەر تیری ڕوانین:

- ئەم هۆزە فەرمانەکانی خودایان پێشێل کردووە و کەوتوونەتە بەر پەلاماری بە تەوژمی ڕق و غەزەبەکەی. خودا بۆ ئاماژە دانی ئیرادە و نیشان دانی حیکمەتی خۆی، لە ڕێگەی نوێنەرێکی خۆیەوە لەم ناوچەیەدا، حوشترێکی لە کەلەکەی شاخە بەردینەیەکەوە هاوردەی دونیا کرد و گیانی پێ بەخشی. فەرمانی بە هۆزەکەشدا ئەم نیشانەیە بپارێزن و نەخەڵەتابن ئازاری پێ بگەیەنن. بەڵام هۆزەکە ئەم فەرمانەیان نەخوێندەوە و کەوتنە پەلاماردانی حوشترە و سەریان بڕی و لەت و لووشیان کرد و بۆ شێویان، گۆشتاویان لێ ساز کرد. ئەوەتا بۆ ئەو کردەوەیان کەوتوونەتە بەر غەزەبی خوداوەند و دەبێ سزای تاوانەکەیان بدەنەوە.

هەستم کرد تا لەو ئاقارە تێدەپەڕین و بەرە و پێش دەچووین، مرۆڤە خۆڵاویەکەی سوارم زیاتر دەپەشۆکێ و بێ ئۆقرەتر دەبێ، دەستێ لە ناخیەوە بەرگری لێ دەکرد کە ڕووە و پێش بچێ، ڕەنگە بەرە و پیری کارەساتێکی مەزن، بەرە و تابلۆیەکی هەردەم زیندووی هاوقەدی مێژووەکەی خۆی. لەم سەر و بەندەدا بوو کە پرینچکەی یەکەم دڵۆپم وێ کەوت. چاوم هەڵێنا، هەورم لە ئاسماندا بەدی نەکرد، سەرم سوڕما ئەم دڵۆپە ئاوە لە کوێوە ئێمەی گرتووەتەوە. بە چواردەورمدا دووووور لە ئاسۆم

ڕوانی، هیچ پەڵـــە هەورێکی بەجێماوی پاش بارانم نەدۆزییەوە. ســـوارەکەم بە قامک ئاماژەی پێدام بڕوانمە خوارمەوە. «جەلەل خالەق!» زێیەکـــی لە زەریا چوو، لە ناوەندیەوە شـــەقی بردووە و لۆیەکانـــی تا ژێر زگمان هەســـتاونەتە ســـەر پێ! من تا ئەم کاتە دیمەنـــی وام نەدیتووە، هەیبەت و قەڵافەتەکەی لەرەی لە دڵم نا. لە ناوەنـــدی کەرتەوە بووی زێکەدا کۆمەڵێک خەڵکی ڕەش و ڕووت، بە هەڵەداوان و گیان لە سەردەســـت، لە پەڕینەوەدا بـــوون. لەو بەری زێکەوە لەشـــکرێکی پڕ چەک و چۆڵێش بە ئەڕڕابە و جبەخانـــەوە وەدوویان کەوتبوون. پاش ئەوەی جەماوەرە ڕەش و ڕووتەکـــە تێپەڕین و دوا کەســـی ســـوپاکەش پێی نایە ناوەندی زێکـــەوە، دوو لۆی لە دیوارچوو و بەرزەوەبووی ئاوەکە، برووســـکە ئاسا یەکیان گرتەوە و ناڵە و شریخەکەی بە دەیان پێ ئێمەی پەرتـــەوازە کرد. دوای قەیرێ ئەم قیامەتە هێور بووەوە و دەتگـــووت ئەو زێ لە زەریاچووە لە مێژســـاڵە نە بای دیتووە و نە بۆران. رووبەرێکی پڕ لە شـــەپۆلۆچکەی مەند و ئارام. جار ناجارێ زێکە، تای لە دار سازکراوی ئەڕڕابەیەکی نووقم بووی، لە قووڵایی خۆیەوە دەردەهاویشـــتە دەرەوە. دەتگوت نە لەشکرێ بوونی هەبووە و نە شەقاربوونێکی ئاوا مەزنیش. تەمێکی غەریب و نامۆ ئەو ناوچەیەی داگرتبوو. لە مێشـــکما پرســـیارەکان، بۆ دەربازبوون پاڵە پەســـتێویان بوو. ڕووم کردە پیاوە خۆڵاویەکە، کە ئێستا بە هۆی پرژە بارانی ڕووداوەکەوە بۆنی خۆڵی پاش بارانی

لێ دەهات و بە نیاز بووم پرسیاری لێ بکەم کە وشەکانمی لە گەرووم‌دا قەتیس دا:

- ئەم ڕووداوەش مۆرکی نافەرمانی خوداوەندی پێوە دیارە و ئاڵقەیەکە لە زنجیرەی ئاڵقەکان و بەسەرهاتەکانی مێژوومان. ئاوێنەی دەقا و دەقی یاخی بوون و لە بەرانبەریشدا، کەوتنە بەر پەلاماری تەوژمی ڕق و تووڕەیی خوداوەندی مەزن. سەرکردەی ئەو لەشکرە دیعایەی خوداوەندی دەکرد و هەستابوو بە کوشتن و بڕینی نێردراوی خودا و دەستە و تاقمەکەی لەم ناوچەیەدا. ئەمە بووە هۆی دەرکەوتنی ئیرادەی بە هێزی خودا و سزادانی تاوانبارەکان و بە دیمانەکردنی ئەم ڕووداوە مەزنە بۆ وەچەکانی داهاتوو.

کە پاش ماوەیەک لە دالآنی زەمەنەوە و بە سەحرایەکی قاقڕدا تێپەڕین، لە ناوچەیەکی هەرە شاخاوی و ڕووبەرێکی چیمەنی مەخمەڵ ئاسادا گیرساینەوە. هێشتا ملە و لووتکەی چیاکان ئاسەواری زستانێکی تووشی پێوە دیار بوو. پاشماوەی ڕندووە بەفرەکانی زستانی ڕابووردوو. لە دامێنەکاندا دارستانی پڕ لە جریوە و تریوەی باڵندەکان، تەژی لە چاوگ و کانیاو و ڕووبارەکان، لێوانلێو لە گوڵ و پەپوولە و وزەوزی هەنگ و مێشە جۆراوجۆرەکان. تابلۆ فەرشێ، پێکهاتوو لە سەدان ڕەنگی سروشتی، بەرگیراو لە گۆشە نیگای بەهەشتی وەعدە پێدراوی خوداوەند. هەروا کە مەحوی تەماشای دیمەنە رازاوەکانی سەر

ڕێی سەفەرەکەمان بووین، لە زنیەکی خرۆشان کە بە درێژایی تەمەنی بوبووە گەردنبەندێکی پێچاوپێچی ڕۆچوو بە ناخی چیاکاندا تێپەڕین. پاش بە جێ هێشتنی چەند چیا و لا باسک، بە سەر وێرانەیەکی ئاوێتە بووی گڕ و دووکەڵ و خوێندا کەوتین. بە دەوری شاردا خەندەقێکی بازنەیی بەدی دەکرا. تا چاو حەتەری دەکرد لاشەی بێ سەر و ئەنجن کرا و شێوێندراوی پیاو و منداڵ. بە زەحمەت بتوانیبا تەرمی بێ گیانی ژنێکیان تیدا بدۆزیتەوە، ئەگەری ئەوە دەکرا کە بە تایبەت ژنەکانیان دەستچین کردبێت. خۆم پێ ڕانەگیرا و لە پیاوە خۆڵاوییەکەم پرسی:

- ئێرە کوێیە؟

تنۆکێک فرمێسک ڕێچکەیەکی لە گۆنا خۆڵاویەکەیدا شۆڕدەوە و بە ڕوومەتیا هەڵخلیسکایە خوارەوە و شوێنەواری جێ هێڵا:

- ناوچەیەک لە زاگرۆس!

- بێ شک دەبێ نافەرمانییەکی گەورەیان کردبێ؟

- نا لالۆ! هێشتا فەرمانیان وەرنەگرتبوو تا نافەرمانی بکەن!

ئەمجارەیان گومانم نەما کە پیاوە خۆڵاوییەکە بە ڕاستی تووشی خەفۆکی بووە و لە ورێنە کردندایە. جا چۆن گەلێ هێشتا فەرمانیان وەرنەگرتووە و دەرفەتی نافەرمانیان پێنەدراوە ئاوا بە توندترین شێواز کەوتوونەتە بەر قین و غەزەبی خوداوەندی

عادڵ و ڕەحمان...؟!

لە سەر داواکاری پیاوە خۆڵاوییەکە ئەو ئاقارە پڕ لە گڕ و خوێنەمان جێهێلا. ڕوومان کردەوە دامێنی ئەو زنجیرە چیایەی پێیدا تێپەڕیبووین. با، بەرامەی خۆڵی ناوچەکانی بەر لە خۆمانی هاوردە دەکرد. ئاشنا بوو. نیگام گوازرایەوە بۆ سەر و چاوە خۆڵاویەکەی سوارەکەم. قرتەی ددانی بە قەتارە دەهات. لەرینەوەی لەشی لە سەر پشتم هەست پێ دەکرا.

«بای بەرزایی ساردە، دڵ و ناخ دەگرێ»

بێ ئۆقرەییەکی قووڵ بە ڕووخسارییەوە دیار بوو یا ڕەنگە سامێ...

چاومان چەقییە سەر جەماوەرێ، لە ناو دڵی چاڵێکی هەڵکەندراودا. لەو لاترەوە کۆمەڵێکی دیکەش ئاخێندرابوونە ناو دۆڵێکی دەستکردەوە. تا دەچووینە پێش تاقمێکی نوێمان دەهاتە پێش چاو، بە ژن و پیاو و پیر و لاوەوە. پێم سەیر بوو ئەم مرۆڤانە هۆی چیبووە خراونەتە ناو ئەم چاڵە دەستکردانەوە. لە ناویاندا سەرنجم چووە سەر زارۆکێ کە داپۆشەکەی، بەرگێکی شینی ئاسمانی بوو، تۆپە لاسقەیەکیشی خستبووە بن باخەڵی، چڵمن و چڵکن و زیتەڵە. لە تەنیشتیەوە پیاوێ بە ناو چاوانێکی چەتوون و ڕیشێکی مام ناوەندی بۆز، هەڵتروشکابوو، بە بەزەییەوە نازی کەزیەی منداڵەکەی ئەکرد. لە ناکاو، لەو دیو بارستایی و کۆگا خۆڵە هەڵدراوەکانەوە، مەکینە گەورەکان هورووژمیان هێنا

و کەوتنــــە پڕکردنەوە و تێکردنـــەوەی چاڵەکان. لە یەک ئان و ســـاتدا قیامەت بەر پا بوو. ئەو کەســـانەی دەیانویست گیانیان بـــدەن بە کۆڵیاندا و دەرباز بین و نەکەونە ژێر لافاو و هەرەســـی گڵ و خۆڵـــەوە، ئەوا بە تیر و گوللـــەی جەندرمەکان دەپێکران. تەمتۆمانی خۆڵ و قریشـــکەی منالّ و شـــریخەی تفەنگ و هارەهاڕی مەکینەکان تا عەرشی ئەعلا ڕۆیی و پەڕەی گوێی ئاســـمانی هێنایە لـــەرە. خۆڵ زاری منالّەکەشـــی ئاخنی و لە زریکەی خست. لە پیاوە خۆڵاویەکەم پرسی:

ـ ئەی تاوانی ئەمانە چییە؟! ئایا فەرمانی خودایان پێشـــێل کردووە؟!

لەو دیو ســـیما خۆڵاوییەکەیـــەوە، کلّپەی هەناوی پژمی و دای لە پرمەی گریان. دوای قەیرێکی زۆر گوێم لێبوو بە دەیان جار لە ژێر لچیەوە دووپاتی دەکردەوە کە:

ـ نازانم، بڕۆ لە خودی خودا بپرسە!

ـ نازانم، بڕۆ لە خودی خودا بپرسە!

ـ نازانم. بڕۆ لە خودی خودا بپرسە...

دواتر بەوەم زانی کە خۆڵی سەر جەستەی سوارە خۆڵاوییەکەم هەمان تۆز و خۆڵی چاڵە دەستکردەکان بووە.

## تەتەرەی دڵی مانئا

■

«ئەم خانووە، ماڵی هێراکلووسە، هەر کەس پێی بنێتە ناوی، پەنا دەدرێ»*

نەریت وا بوو هێرا، شاژنی زێئووسی خوداوەندی خوداکان بە پێی بڕیارێ، لە ئەشکەوتی کەرەفتوودا داڵدە و پەنای کەسە لێقەوماوەکانی ئەدا کە بە هەر هۆکارێکەوە لە سووڕانی بەرداشەکانی ژیان فڕێدرابوونە دەرەوە و لە هەوڵی پەناگەیەکدا بوون بۆ حەوانەوە و دەستگیرۆییان. پێش ئەوەی پەنا بدرێن، لە بەر دەروازەی ئەشکەوتەکەڕا دەبووا چوارمیلکە دابنیشن و پاش گێڕانەوەی کورتەیەک لە بەسەرهاتیان، بۆ ماوەی حەوت کاتژمێر نەجوڵێن و بکەونە نزا و پاڕانەوە، بەشکوو هێرا بەزەیی بجووڵێ و دەروازە بەردینە مەڕمەڕەکەیان لێ بکاتەوە و بیانخاتە ژێر چاوەدێری خۆیەوە و پەنایان بدات. دەگێڕنەوە زۆر جار هێرا «ژنوونی ڕۆمی» خوداوەندی ئاسمان و مانگ، هاوسەری زێئووس «ژووپیتێری ڕۆمی» لە بەر ئەوەی پەناگەکەی لە ڕەونەق

نەکەوێ و مەودای بەزەییەکەی پەرەپێ بدا و لە ناو گەڵەکاندا حورمەتیان وەمێنێ و هەڵنەبواردرێن، داوای لە زینووسی مێردی دەکرد، ئارەسی کوڕیان کە بە خوداوەندی وەبا و جەنگ و وێرانی دەناسرا بنێرێتە ناو هۆزەکانەوە و بدا لە تەپڵی شەڕ و بە گژداچوون و هەڵامە ســـاز بکا. بۆ ئەوەی پەناگەکەی هێرا ببێتە مەکۆی حەوانەوەی بێدەرەتان و شـــەڕلێدراوەکان و سووکنایش بگاتە دڵی خواژنی گەورەوە. ئارەس «مارســـی ڕۆمی» خوداوەندی قات و قڕی و کوشتن، بێ سەبرانە چاوەڕوانی فەرمانی باوکی بوو تا ببێتە کوتکێ و دابێتەوە بە سەر گەلەکاندا و بکەوێتە دابەزاندن و جـــێ بەجێ کردنی ئەمرەکەی باوکی. فاڵەکە ئەمجارەیان بە ناوی شاری حەوت شوورە یا شاری ڕەنگەکان دەرچوو.

ماننا کوڕە وەرزێڕێکی ناوچەی ســـەکاکز* دەبێ کە سێ ســـاڵ لەوەبەر بە فەرمانی فەرمانڕەوای شـــاری ڕەنگەکان بۆ ڕەنگ کردنی حەوت دیوارەکەی دەوری شـــار بردرابووە پێتەخت و لەوێ بە گەرمی ســـەرقاڵی کارە پێسپێردراوەکەی خۆی دەبێ کـــە ماوەیەک لەوە پێش لافاوی وێرانی و شـــەڕ، ڕایدەماڵێ و بە گوێرەی ناوبانگی پەناگەی کەرەفتوو، ڕاپێچی ئەو ناوچەیە دەبێ. لەو ســـەر و بەندەدا هێرا، هێرمێس «مێرکووری ڕۆمی» خوداوەندی ڕێنیشـــاندەر بەڕێ دەکا بۆ یارمەتی ماننا و تا پشت دەروازەی ئەشـــکەوتەکە، دەبێتە ڕێنمـــای. ماننا کە لە ئاگری شـــەڕێکی وێرانگەر قوتاری بووە و دەرد و ئازاری ســـەفەرێکی

دژواری لە چەنتەدایە، دڵەتەپەی چوونە ژوورەوەیەتی. دەکەوێتە سەر چۆک و هەردوو لەپی دەستی وێک دەنێ و بە نیشانەی دووعا پێلووەکانی دەبەستێ و بە سۆزەوە دەڵێ:

ـ هێرا! هاوسەری خوداوەندی خوداکان، خوداوەندی پاسەوانی لێقەومـاوان، خوداوەندی مانگ و ئاسـمانەکان، بەزەییم دەوێ. تکایە دەرگاکەتم بە ڕوودا بکەرەوە، تکایە لە سـۆزی خۆت بێ بەشم مەکە، تکایە...!

ماننا بە بەرگێکی ڕیشاڵەوەبووی ڕەنگاوییەوە ماوەیەک لە ڕێی وەڵام مایەوە. دەنگێکی نەرمی سـۆزاوی ژنانە، لە دالآنی دەرەوەی ئەشکەوتەکەڕا، تەتەرەیەکی خستە دڵیەوە:

ـ بەسـەرهاتەکەت بگێڕەوە، بە بێ درۆ و پێوەنان، ئەگەر لەم مەرجانە دەربچی، وەرناگیردرێی و دەرگاکە بە ڕووتدا ناکرێتەوە و دوور دەخرێیتەوە و تاسەر بە تەنیا و سەرگەردان و لە چاوەڕوانیا دەمێنیەوە. هۆشت بە زمانتەوە بێ، نەدۆڕێی!

ماننا هەناسە و هیوایەکی وەبەر گەڕا، لەوە پێش بیستبووی کە گوتووبویان:

ـ «خوا لاڵە! بۆیە هەر کەسێ ڕاست بووەتەوە و بۆچوونێکی داوەتە پاڵ»

بـەڵام ئەمە نە خەو بوو، نە خەیاڵ، بەڵکوو خودی هێرا بوو لە بەر دەروازەی ئەشکەوتەکەی کەرەفتوودا ڕاستەوخۆ لە تەکیا ئەدوا. تەکانێکی بە خۆیدا، بووخچەکەی شانی کردەوە و داینا.

لە حاڵێکدا کە لەرز و شپرێوییەکی ئاستەم بە دەنگیەوە دیار بوو، کەوتە گۆ:

- من ماننا کوڕە وەرزێڕێکی ناوچەی سەکاکزی سەر بە ئیمپراتۆرییەتی مادی مەزنم. وەک بیستوومە یەکەم خەونمان لە کەنارەکانی زەریای باکووردا پێ گەیشتووە، لە تووڕای عیبریدا ناومان هاتووە، میری گەورەم دیاکۆشا بۆ یەکەم جار پێتەختەکەی لە بنارەکانی ئەلوەندا پێک هێنا کە بە هەگمەتانە دەناسرێ. هەگمەتانە بە شاری قەسری حەوت حەسار ناوی دەرکردووە. دەگێڕنەوە چێوەی حەسارەکانی ئەم شارە مەزنە، لێکچوویەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە لە گەڵ ئاتێن، پێتەختی یونانی مەزن. ئەم حەوت حەسارە بە شێوەیەکی بازنەیی بە دەوری شاردا ساز کراون و هەرکامەشیان بە ڕەنگێکی جیاواز بۆیاخ و تا بەرە و ناوەند دەڕۆی، دانە وە دووی دانەدا، بەرزتر دەبنەوە. من و چوار هاوڕێی دیکەم لە لایەن گەورەکەمان، ئەژدیهاک شاوە شەرەفی ئەوەمان پێ بەخشرابوو، حەسارەکان بە ڕیز: یەکەم بۆیاخی سپی، دووهەم ڕەش، سێهەم ئەرخەوانی، چوارەم شین، پێنجەم نارنجی و شەشەم بە زیو و دوا دیوارەکەش بە زێڕ وەرازێنین. بارەگای میری گەورە ئەژدیهاک شا و خەزێنەکانی لە دوا حەسار و لە ناوەندا جێگیر کرابوون. شارێ پڕ لە گوڵ و باڵندە، شارێ لە هەموو ڕەنگ و ڕوخسارێکی تێدا بەدی دەکرا. خەڵک لە ئاسایش و تەباییدا ژیانیان دەبردە سەر و لەم سەراوسەری دونیادا بە شاری ڕەنگەکان

ناوی دەرکردبوو. شـــاری پەرتووکەکانی گەنج نامە و شـــاری خەونە ڕەنگاوڕەنگەکان. تا لە ناکاو هێرمێس خوداوەندی شــەڕ و پێکــدادان، لاپەڕەی لێ هەڵدایەوە و ملۆزمێکی بۆ تاشـــین. کچەزایەکی ئەژدیهاک شا، کوروش، کوڕی ماندانا خاتوون، بە یارمەتی بابلیەکان کە دوژمنی سوێند خواردووی باوە گەورەی بوون، هێرشیان کردە سەر پێتەختی ڕەنگەکان و ئەژدیهاک شایان بــە دیل گرت. هەگمەتانە بێ ناز کەوتەوە و خرایە بەر دەســـتی نەیـــاران و دوژمنانی ئیمپراتووریەتی مادی مەزن. هێرا! خواژنی گەورە! ئێســـتا ماننا لێقەوماوە و بێ دەرەتان، بێ گەورەیە و بێ پادشـــایە. تکات لێدەکات ببیە پەناگەی و لە بەزەیی خۆت بێ هیوای نەکەی...

هێرا، خولیایەک لە مێشکیا بوو، ویستی ئەو خولیایە زیاتر بکاتەوە، لێی پرسی:

- ماننا دڵنیای لەوەی کە وڵامەکەت ڕاستە و چەواشەکاری تێدا نییە؟!

- هێرای مەزن! دڵنیام لەوەی کە ئەیڵێم و گومانم لە ڕاستی وڵامەکەم نییە!

هێرا دەیزانی؛

«مرۆڤ تەنیا بینایەکە تا پتر بلەرزێ زیاتر ڕەگ دادەکوتێ و قایم تر دەبێ»

هەر بۆیە کەوتە یاری لە گەڵیا:

- زیپیا* و ئارماسیت* نایاتەوە بیرت؟!

دەســـت بە جێ ماننا هەســـتی کرد دۆڕاوە. نزیک بوو لە هۆش بچێ، بەڵام هێزێ لە ناخیەوە ڕایگرت. دەنگێ پێی گوت: خۆراگــر بە، ئەمە تاقی کرنەوەیە، ئەگـــەر خاڵ نەدەی ڕەنگە هێـــرا بە هەڵەدا بچێ و یارییەکـــە ببەیتەوە. بە خۆیدا چووەوە و هەناسەیەکی بەر خۆیدا و ڕاشکاوانە و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- تا ئێستا ئەم ناوانەم نەبیستووە!

- یارمەتیەکت ئەیەم. دوو قەڵای بە هێز بوون لە ســـەردەمی دەسەڵاتداریەتی ماننا کاندا لە ناوچەی سەکاکز کە دەبێتە دەور و بەری زێدەکەت، هەنوکەش نایاتەوە بیرت؟!

ماننا بەڕاستی ڕابوردووەکەی خۆی لە بیر چوبووەوە تا ئەو کاتەی کە هێرا ناوی قەڵاکانی زیپیا و ئارماسیتی هێنایەوە بەر بـــاس. ئەو دوو قەڵایە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە لایەن باو و باپیرانیەوە لە هێرش و پەلاماری دەوڵەتانی ئاشـــوور و ئوراتوورەوە پارێزراو بوون، یەکێک لە پادشاکانی ئاشوور بە ناوی سارگێنی دووهەم لە هێرشـــێکی بێ ئاماندا پێتەختی ماننا کان دەخاتە بەر پەلامار و پاشـــاکەیان بە ناوی ئێراندووز دەکوژرێ و قەڵاکانیش بێ پشتیوان دەمێننەوە. لە ئەنجامدا سارگێنی دووهەم، دەست بە سەر قەڵاکاندا دەگرێ. دواتر کە ئیمپراتووریەتی مادەکان پێک هات و دیاکۆ بوو بە ڕەمزی یەکگرتن و یەکخســـتنی شانشینە بچووکەکان و بە دەســـتی ئەوان ئاشووریەکان شکێندران، گەلی

ماننا شادمان بوون و هەستیان بە قەرەبووبوونەوەی ئازارەکانیان کرد، بەم بۆنەیەوە بڕیاریاندا لە ناو ئەم ئیمپراتۆریەتە مەزنەدا کە لە ئەفغانستانەوە تا شام باڵی کێشابوو، بتوێنەوە و بۆ هەتا هەتایە نیشتەجێ ببن، هەست بە شانازی بکەن بە مەملەکەتەکەیانەوە و خەمی ئەوەشیان نەبێ کە ناسنامەی خۆیان لە بیر بچێتەوە. منناش یەکێک بوو لەو کەسانە کە هەستی دەکرد خوێنی ماد لە دەمارەکانیا دەجووڵێ و لای ببوو بە باوەڕێکی بە هێز. دەشیزانی کە ناتوانێ لەوە زیاتر هێرا بجەڕێنێ و گومڕای بکا. تێفکری لەوەی کە بۆ وا بە زەلیلی ببووە کەرەستەی یاری دەستی خواکان؛ هێرا «ژنوونی ڕۆمی» خوداوەندی داڵدە و بەزەیی و ئارەس «مارسی ڕۆمی» خوداوەندی قات و قڕی و جەنگ. چەند بە زەبوونی کەوتبووە سەر چۆک، بەشکوو سیلەی بەزەییان بجووڵێ و لە سووچێکی ئەم ئەشکەوتە سارد و سڕەدا بۆ ماوەیەک لە دەستی تەقدیر بیشارنەوە و حەشاری بدەن. خۆی زۆر بە کەم هاتە بەرچاو؛ «مەرگ جارێ و شیوەن جارێ» هەستایە سەرپێ و بە دەنگێکی ڕاشکاوانە گوتی:

ـ هێرا! خوداوەندی ئاسمان و بەزەیی! من لێرەدا ئاشکرای دەکەم کە هەڵە بووم. بۆ من شەرم و جێی داوەشینە کە لەوە زیاتر وەک سەگی بەر قاپیەکەت، کلکم ڕاوەشێنم و لمۆزت لێ خشکێنم و بکڕووزێمەوە. باوەڕم هێناوە کە مردن جارێکە و ترس و بێ ئامانیەکەشی سەدان جار. لەمە و دوا، بڕیار ئەدەم کە بە

پشـــتیوانی ئاتنە؛ «مینرۆی ڕۆمی» خوداوەندی سپەر، میری ئاوەز و هونەر، بە گڕ ژیاندا بچمەوە و بەڵێن بێ تا دەســـتەمۆی نەکەم، نەحەسێمەوە...

قاقایەکێ بە کوڵی ژنانە چنگی لە دیواری ئەشکەوتەکە دەگرت و خەریکی نانەوەی تەتەرەیەک بوو لە دڵی ماننادا ...

**ژێدەر**

* ئـــەم وتەیە بە زمانی یونانی لە ســـەر یەکێ لـــە دەروازەکانی ئەشـــکەوتی کەرەفتوو ســـەر بە ناوچەی ســـەقز لە ڕۆژهەڵاتی کوردوســـتاندا هەڵکەندراوە. پێویســـت بە ئاماژەیە کە مێژووی ئەم ئەشکەوتە دەگەڕێتەوە بۆ پێش مێژوو.
* سەکاکز لە کۆندا بە شاری سەقز گوتراوە.
* زیبیا لە کۆندا بە قەڵای زێویە سەر بە ناوچەی سەقز گوتراوە.
* ئارماسیت قەڵایەکی بە هێزی ماننا‌کان بووە لە پێنج کیلۆمەتری قەڵای زێویە، سەر بە شاری ســـەقزی ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

##ماننا و سەفەرێکی خۆخواز

■

هێـــزا؛ «ژنوونی ڕۆمی» خوداوەندی ئاســـمان و مانگ و بەزەیی، هاوســـەری زێئووس؛ «ژووپیتێری ڕۆمی» خوداوەندی خوداکان، پـــاش ئەوەی کە ماننا، ڕەنگڕەژێکی پەرتەوازە بووی هەگمەتانە، بە کردەوەیەکی نەشـــیاو، بوو بە هۆی تووڕەکردنی ئەو و ڕەگەی ڕقی هەناوی ژیاندەوە و لمۆزی لە خاکدا، وێنەی مـــاری کۆڵەوار، ژان، ڕاپێچی کـــرد و کەوتە نانەوەی کەتنێ لە ســـەر ڕێی ماننـــا و بیری لە پیلانێکـــی خوداوەندانە کردەوە تا جومگەکانی پێ بنووشـــتێنێتەوە و بیهێنێتەوە سەر چۆک و لەو ئاکارەی کردوویەتی پەشـــیمان بێتـــەوە و داوای لێبووردنی لێ بکا. لەم لاشـــەوە ئاتنە؛ «مینـــڕۆی ڕۆمی» خوداوەندی ســـپەر، میری ئاوەز و هونەر، دوای هەڵچوون و بە گژداچوونی ماننا، ڕۆحێکی ســـەرکێش و یاخی لـــە دەروونیا بەدی کرد و بڕیاریدا باڵەکانی خۆی بە ســـەریا بکێشێ و بیخاتە ژێر سێبەر و چاوەدێری خۆیەوە و لە دۆزینەوە و دەســـتەمۆ کردنی ژیاندا بە

هانایەوە بێ. بەڵام نەریت وابوو تا لە لایەن کەسێکەوە بانگهێشت نەکرابا، ئاتنە، دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەدەکرد. هەر بەم بۆنەیەوە، لە چاوەڕوانیدا مایەوە، تا بەشکوو ماننا بە هۆگریەوە، بکەوێتە شوێنکاتی ئاتنە و یارمەتی لێ بخوازێ.

دوای ئەوەی ماننا لە بەر دەروازەی ئەشکەوتی کەرەفتوودا بەرهەڵستی نەریتی باوی خوداوەندی بەزیی، هێرا بووەوە و لە پاڕانەوەی بۆ پەناگرتنی لەو پەناگەدا، وەک یاخی بوونێ، پاشەکشەی کرد، ناشارەزا یا لە مەڕ بەسەرهات و ڕابوردووەکەیەوە، بە هەڵە دووا و، پێشێلکاری نەریتی باوی کرد و دواتر کەوتە بەر قین و تووڕەیی خواژنی گەورەوە. هێرا، بڕیاریدا، کۆ وێردێ، بەرهەم هاتوو لە سێ ئاکاری دەروونی خۆی، ئاوێتەی ڕۆحی ماننا بکا و تەمێکی تەنکی پەڕەئاسای ڕەش بە سەر گلێنەی چاویا بکێشێ. هێشتا ماننا، بوخچەکەی لە شان نەکردبووەوە و دوا دالانی بێ دەروازەی ئەشکەوتەکەی جێ نەهێشتبوو کە چاوەکانی لە ڕەشەوە هاتن و تریەی دڵی کەوتە قۆناغی بەرز بوونەوە. تەتەرە و ترسێکی لە ڕادەبەدەر، باڵی بە سەر گیانیا کێشا. هەستی کرد بوومەلەرزەیە و گڕکانە و ڕووبەری ئەشکەوت لە شەق بردندایە و خەریکە دەم ئەکاتەوە. لەرزی، وەک تاقە گەڵایەکی ڕەنگهەڵگەڕاوی پێوەماوی پاییزی دارچنارێ، لە ڕووی خۆر و لە بەر وژە وژی بای شەماڵدا. هێرای قیناوی بوو کە تۆوی تەنیایی و چاوەنواڕی و سەرگەردانی لە دەروونی

ماننادا چاند. ئان و ساتی چووزەرەدانی لاسقە گیایەکی سێ چووکە لە ڕووبەڕی ناخیا. دەنگێکی زیکەداری ژنانە بە گلۆڵەیی، ڕاپێچی ئەم بەراو بەری دیوارە بەردینەکەی دالانی ئەشکەوتەکە بوو:

ـ ماننا! کوڕە ڕەنگڕەژە لێقەوماوەکە! نەتزانیبوو بڕیاری خوداکان یەکێکە و پاشگەز بوونەوەی نییە و پێداچوونەوەی مەحاڵە؟ نەتزانیبوو ئەگەر مرۆڤێ بیهەوێ هەرکام لە خوداکانی دەستەڕۆ بکا و تەفرەیان بدا، بۆ هەتا هەتایە دەکەوێتە بەر ئاگری ڕق و دواجار، سزا تایبەتییەکانی خۆی بە سەریا دەسەپێنێ؟ فەرامۆشت کردووە پێش ئەوەی بەسەرهاتەکەت بگێڕیتەوە، ئاگادارم کردیتەوە کە؛ ئەنجامی چەواشەکاری سزایە و نەخەڵەتابی بدۆڕێیت و تا تیرت بسڕ دەکا، بە هەڵەدا نەچی و هۆشت بە زمانتەوە بێ؟ ئێستاکە، ئەمە دەسپێکە بۆ تۆ، سەرەتایەکی ڕەشی بێ ڕۆژنە و بێ ڕووناکی لە چارەتا. لە ڕێکەوتی ئەم چەواشەکاری و یاخی بوونەتەوە، وەک ڕووهەڵماڵیوێکی ئابڕوچووی دەرکراو، تەنیا دەکرێی؛

«لە ئەزەلەوە تەنیایی داپۆشێکی ڕازاوەی یاخی بووەکانە»

پاشان وەک شەمشەمە کوێرەیەکی ناو بوومەلێڵی ئێواران، پەتای سەرلێشێواوی دەتگرێ؛

«لە ئەزەلەوە سەرلێشێواوی، ژێر پۆشێکی ڕازاوەی بەرهەڵستکارەکانە»

دواتر وەک کووندە پەپوویەکی نەجوولێ سەر پەلکە داری دارستانێکی وشکارۆ، بەردەوام بە دوو چاوی کراوەی زەقەوە چاوەنوارڕ دەکرێ؛

«لە ئەزەلەوە چاوەڕوانی ڕووپۆشێکی ڕازاوەی لادەرەکانە».

لە ئەنجام و لە گێژەنی ژیاندا، دەبیتە یاخی بوویەکی چارەڕەشی تەنیا و سەرلێشێواو و چاوەنوارڕ.

ماننای لاشەڕی بێ خودا! لە یادت بێ ئەم سێ بەرگە ڕازاوەیە، تایبەتە بە هاوچەشن و هاومەرامەکانت و هەرگیز نابێتە داپۆشی جەستەی پەنادراوە لێقەوماوەکانی نێو ئەم کۆنە ئەشکەوتەی کەرەفتوو!

ماننا وەک کووتەڵەیەکی تازەزاوی ئاژەڵێک، لەرزە لەرز هاتە سەر چمکان و بە لادەرگای دەروازەی ئەشکەوتەکەی کەرەفتووڕا خۆی گرتەوە و هاتە سەر پێ. بێ ئەوەی ئاوڕ لە دەرگا مەڕمەڕەکە بداتەوە و توانای وەڵام دانەوەی هێرا؛

«ژنوونی ڕۆمی» خواژنی گەورەی بێ، لەچکی بووخچەکەی وەدووی خۆیدا، بەرە و دەستەمۆ کردنی ژیان و چارەنووسێ کە خۆی دیاری کردبوو، پەلکێش کرد. ئاتنە؛ «مینرۆی ڕۆمی» خوداوەندی سپەر، میری ئاوەز و هونەریش، بێ سەبرانە چاوەڕوانی دەم بزووتن و یارمەتی خواستنی ماننا بوو. خوداوەندی هزر، باش دەیزانی کە:

«سەربووردەی مرۆی یاخی، ئاوێنەی جەنگ و

بەرەنگاربوونەوەی خوداکانە، ئەم سەربووردەیە؛ تەژییە لە ترس، پڕە لە ژان، لێوانلێوە لە مەرگ و ژیانەوەی چەند جارە. ئەم سەربووردەیە؛ تایبەتە بە مرۆیەکی ڕەنگ ڕەژی یاخیەوە کە نایهەوێ وەک پەنادراوێکی دەستەمۆی هێرا؛ خوداوەندی بەزمیی، ڕۆحی داگیر بکرێ و بێ پەل و پۆ، بئاخندرێتە نێو قەفەسی ئەشکەوتی کەرەفتووەوە»

ئاتنە، باش دەیزانی کە؛ کەژەرپێیەکی سەغڵەتە ڕێگا هەڵبژێردراوەکەی ماننا و بە بێ پشتیوانی ئەو مەحاڵە بگاتە جێ و بە ئامانج بگا.

ماننا، بە دڵێکی کۆڵەوار و جەستەیەکی ماندووەوە، لە بەر دەروازەی ئەشکەوتی کەرەفتووڕا، لارێی گرتەبەر، بەشکوو دەرفەتێکی بۆ برەخسێ بە لاشانی ئەشکەوتەکەوە بەرە و ژوور هەڵزنێ و لە سەر بانی ئەشکەوتەکەڕا بۆ ماوەیەک پشوو بدا و بیر لە تونێشووی سەفەرێکی خۆخواز بکاتەوە. ڕەگەیەکی ڕەش، هەڵەی دەخستە بیناییەوە و تووشی کەم بینی دەکرد. خڕکە و تاشە بەرد و تاوێری ئەو ناوەی، بە زەحمەت لێک هەڵدەبوارد. لە گەیشتندا، پڕ بە دڵ هەستی بە تەنیایەکی لە ڕادەبەدەر کرد. پەتا و لەرزە، جێی نەهێشتبوو. هالاوێکی سووتێنەر لە ناخیەوە هەڵدەکشا و خۆی لە دونیای ئازاددا دەرباز دەکرد. کەوتبووە بەرزی. ڕوانییە دەور و پشتی، تاچاو حوکمی دەکرد چیا و دۆڵ و خاکێکی مەیلە و سووری قاقڕ و ڕووت. شێواو و لانەواز و بێ

کەس و بێ خوا مابووەوە. نەیدەزانی ڕووە و کام لا ئاڕاستە بێ. ئەژنۆکانی لە باوەش نا و لاڕوومەتی نایە سەر کەڵکەکانی. دڵی ختوورەی ئەدا کە دەستێ لە شوێنێکی نادیارەوە بە هانایەوە دێ. لە چاوەڕوانیەکی مەرگاویدا مایەوە. ئارام پەلکێش بوو بەرە و دونیای خەونەکانی، ڕەنگە ئاتنە، ویستبێتی لە ڕێگای خەونەکانیەوە ماننا بە سەر وەکا، بێ ئەوەی نەریتەکانی خۆیشی پێشێل کردبێ ...

لە کۆنەوە گوتوویانە:

«لە سەر هیچ ڕێیان مەخەوە، هیچ خەونان نابینی.»

واتە:

«ڕێگایە، داخوازی خەونە و بێ خەونیش، بێ ڕێگاییە!»

**ژێدەر**

* تێبینی: ئەم چیرۆکە درێژەوەبەرووی چیرۆکی «تەتەرەی دڵی ماننا»یە و بە تەنیاش دەچێتە چێوەی چیرۆکێکی سەربەخۆوە.

##ماننا و خەونێکی بێ کۆتایی

■

«ناوچەکانی خــەون، قەدەغە ناکرێن و پەرژینەکان، بەوێ نامۆن»

ماننــــا، کەوتبــــووە چەقی خەونێکی بێ ســــنوورەوە. ببووە رێبــــواری کەژە رێیەکی ســـەغڵەت و ســـەرقاڵی رێپێوانێکی ئاهوورایی بوو لە بەســـتێنی خەوە کەروێشـــکەیەکدا. تا ئاتنە؛ «خوداوەندی هزر و هونەر» لە شـــەماییلی پیرە پیاوێکی شیرین کەلامی روومەت روون و ردێن سپیدا، وەک کارگە بە سورکەی پاییزی لە قەراغ رێیدا دەرتۆقی.

ـ چییە لالۆ؟! دەڵێی هێرکولی و دونیات سەرشـــانی ناوە و خەریکە بە عەرشدا هێور و نەرم هەڵدەزنێی؟!

ماننــــا کە لــــە بوومەلێڵی خەونەکەیدا کتوپــــڕ لووتی بەر کەپووی زەلامێکی کۆنەســـاڵ کەوتبوو، ڕاچڵەکا. قورســـایی نیگای خستە سەر ڕدێنە سپیەکەی و بۆچرووکی هەناسەیەکی مەودا داری دایە دەرەوە و گوتی:

ـ ڕێگایەکی تووشـــم بڕیوە و وێڵم بەدوای شتێکدا، ناشزانم چۆنە و چییە و لە کوێیە! شەکەتم، زۆۆۆۆریش شەکەت...

پیرە پیاوە کۆماوە ئێسک سووکە لەبز شیرینەکە، هەڵوەدای باوەشـــە بەردێک بوو، دۆزییەوە و بە یارمەتی گۆچانەکەی لە سەری هەڵترووشکا:

ـ لالـــۆ! وادەردەکـــەوێ یاخی بووی و بە گـــژ خوداکاندا چوویتـــەوە، واش پێدەچـــێ؛ کەوتبیتە بەر ڕقیـــان و لە ئەماندا نەمابی، ئەی ئێستا لە چی دەگەڕێی؟!

ـ لە ژیـــان! دەمهەوێ بیدۆزمەوە و دەســـتەمۆی کەم و بە هێزا و زێئووسی نیشان بدەم کە؛ بێ بەزەیی و یارمەتی ئەوانیش دەکـــرێ کە بگەم بە ژیان و کەوی بکەم. نامهەوێ چیتر لێیان بپاڕێمەوە و بکەومە بەر پێیان و ببمە کاسەلێس و کلک بادەریان. چاوەڕوان بم کە سیلەی بەزەییان بجووڵێ و بۆ ئاوڕێکیان؛ هەزار جار ســـووک و چرووک بکرێم و هەموو ساتێ لە شەرما ببم بە دڵۆپێ ئاو و بە زەویا ڕۆچمە خوارەوە.

ـ ئەی بۆ دەســـتە و داوێنی ئاتنـــە؛ «میری ئاوەز» نابی؟ بێگومان ئەو لەم بارەوە، زانیاری تەواوی پێیە، دەتوانێ بتگەیەنێتە سەر مەنزڵی ژیان؟!

ماننا، هەستی کرد ئەم پیرە مێردە، هەڕەی لە بڕەی دەکاتەوە و چەنتەی شـــتێکی تێدایە. بەرە و پیری کشـــا و لە تەنیشتی هەڵکورما:

ـ کاکــە مام! ئەوەندە تاڵی و ســوێریم لە دەســت خوداکان چێشتووە، بەرامبەر بە هەمووان بێ باوەڕ بووم، هەر لە دەسپێکی تەمەنمــەوە تا ئێســتا، جێ پەنجەی خوداکانی پێــوە دیارە. لە ناوچەی سەکاکز، ئارەس؛ «خوداوەندی قات و قڕی و کوشتن» بڕیاری شــەڕێکی وێرانگەری بەسەرماندا سەپاند. پاشان وەک ڕەنگرەژێ بانگهێشت کرام بۆ هەگمەتانە پێتەختی ڕەنگەکان و ماوەی چەند ســاڵ سەرقاڵی ڕەنگرەژی دیوارەکانی دەوری شار بووم کە؛ دیســانەوە کەوتینە بەر پەلاماری دەستی شەڕەنگێزی ئارەس، کەلەلا و بێ دەرەتان، ڕوومان کردە ئەشکەوتی کەرەفتوو، مەکــۆی داڵدە و بەزەیــی، کە دواتر لێم ڕوون بــووەوە، ئەوێش ئەو پەناگە و حەســانگەیە نییە کە چاوەڕوانــی بووم، بەڵکوو بەندیخانەیەکــی گەورەیە و تا مەرجەکانــی بەندییەکی تەواو عەیارت تێدا نەبێ، وەرناگیردرێت و ناچیتە ژێر سێبەری بەزەیی هێرا؛ «خواژنی گەورە»وە. تا چەشــنی کووپە و گۆزەڵە سەدان جار، بە بەرد و دارتا نەدات و لە ســەد لاوە درزت تێ نەکات و نەتشکێنێ و نەتپروێنێ، ئۆخژن بە دڵی ناگات و لێورێژ نابێ لە تام و چێژی گەمەکەی.

وا هەست ئەکەم ئاتنەش، یەکێکە لەوان و دڵم بەرایی نادا و ئاو ناخواتەوە. ئاگاداری ئەوەشم کە؛ «هیچ خەنجەرێ، دەسکی خۆی نابڕێتەوە». بۆیە ئەوەندە بوغز گرتوومی و لە ناخما پەنگی خواردووەتەوە کە تەنانەت ئامادەش نیم دەستە و دامێنی ئاتنە ببم

و یارمەتی لێ بخوازم ..

ئاتنە، باش دەیزانی کە؛ «هەر خودایەک تایبەتمەندییەکی نەگۆڕی هەیە، ئەویش کردەوەکەیەتی» و «خوداوەندکان لە ڕووی دوونیاێ بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان» و «شەڕ، ئاشتی، ڕق، بەزەیی، خۆشەویستی و ... ئەو تایبەتمەندییانەن کە کات و شوێن ناناسن و تەمەنیان بەندە بە تەمەنی خوداکانەوە». دەشیزانی کە ئەگەر، مانىنا، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بەم واتایانە بگات، ئەوا دەبێتە کوتکێکی بە تەوژم کە بەر ڕۆحی دەکەوێ و لە گرێژنەی دەبا و بێ هیوا دەست لە هەموو شتێ دەشواتەوە و تاقە ڕێی «مەرگ» هەڵدەبژێرێت. ئەوەشی دەزانی کە پاش ئەم دەرکەوتەیە و مەرگی مانىنا ماوەی خودایەتییەکەیان کۆتایی پێ دێت و گەمەکانی نێو ئەم کەوشەنەش، تەنیا بە دەردی لاپەڕەکانی مێژوو دەخوات، ئەویش بە بێ خوێنەر!. هەر بۆیە کەوتە خۆ ڕێگەیەک بخاتە بەردەمی مانىنا، بەشکوو دڵخۆشی بکات و ئەوەندە سەرقاڵ ببێ کە؛ بیر لە کردەوەی خوداوەندەکان نەکاتەوە. دوو ڕێی هاتەوە یاد؛ یا بینێرێتە سەر زێی گەورە و هێڵەکێکی بداتە دەست و لێی بخوازێ کە بەردەوام و نەپساوە لە ئاوی چۆمەکە هەڵێنجێ، تا جارێ لە جاران بتوانێ پڕ بە هێڵەکێ ئاو ڕاگوێزێ بۆلای و ئەمیش لە باتی، ڕێی دەستەمۆ کردنی ژیانی پێ نیشان بدات، یا بێ وچان بکەوێتە شوێن هەورە ئاوس و باران گێڕەکان و دوای تاوێکی بە گوڕ و داتەکاندنیان

و دەرکەوتنی کۆلکە زێڕینە، بە پەلە بیگاتێ و لە باوەشـــی نێ و بە خۆیەوە ڕایمووسێ.

ئاتنە، لە شەماییلی پیرەپیاوەکەدا و بە یارمەتی گۆچانەکەی هەســـتایە سەر پێ و چەند هەنگاو لەماننا دوور کەوتەوە و ڕوو لە کۆمەڵێک هەوری ڕەشی ئاوس کە لە ئاسۆوە دەرکەوتبوون، ڕاوەستا و لە حاڵێکدا کە پشتی لە ماننا بوو و چاوی لە چاوی هەڵکەندبوو، بە نووزەیەکی پیرانەوە گوتی:

- لالۆ! وادیارە چەرمەســـەری دونیات بە ســـەردا هاتووە و لە ڕادەبەدەر چەوســـاویتەوە، لە دڵمەوە بـــۆت بەداخم و لە گەڵتا هاو ســـۆزم. ئەگەر لێـــم وەربگری و لـــە ئامۆژگارییەکانم لا نـــەدەی، دەمهەوێ کەمێ لە مەینەتییەکانت کەم بکەمەوە و بە ئاسوودەییت بگەیەنم. ئایا دەتەوێ ژیان دەستەمۆ بکەی؟ ئەگەر گوێ بە قســـەکانم بدەی، بۆ ئەم کارە، ڕێگایەکت دەخەمە بەر دەم، پێویستیت بە ئاتنەش نەبێ؟!

مانننا وزەیەکی هاتەوە بەر و تینی بە قسەکەیدا:

- کاکـــە مام! ئایا ئەم قســـەیە ڕاســـتە و دەتوانی خۆت لە کاروباری خوداوەندەکان هەڵقورتێنی؟

- لالـــۆ! ئەو ڕێیەی تۆ گرتووتە بەر، من دەمێکەیە پێوامە و ئەگەر بێ پشتیوانی خوداکان بووایە، هەرگیز نەمدەتوانی بەم شوێنە بگەم. ئێستاش بە قەد پیرە مەڕێ تەمەنم ماوە و دەمەوێ ئەزموونی ژیانم لە پاش خۆم جێ بهێڵم.

ـ کاکە مام! ئەگەر بتوانی ژیان بنێیتە ناو دەستمەوە، بەڵێن بێ هەتا هەتایە، دەبمە مورید و ئیمانداری تۆ و لە ئامۆژگارییە بە نرخەکانت دەرناچم.

ماننا، لەو ڕۆژەوە و دوای وەخەبەر هاتنەوەی لە سـەر بانی ئەشکەوتی کەرەفتوو، تەنیا و هەراسان و بێ حەوانەوە، ڕۆژی لێ نەبوواردووە و شـێلگیرانە، لە هەر ناوچە و سەرزەمینێ سوونسەی بارانـی کردبێ، خۆی گەیاندووەتـێ و چاوەڕوانی دەرکەوتنی کۆلکە زێڕینە بووە، پاشـان چووەتە سەروەختی و باوەشی ئاواڵە کردووە بۆ لە ئامێزگرتن و ڕاموسانی. لە پیرە پیاوەکەی بیستبوو کـە: «ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان، بەخت یاوەرت بوو و توانیت ئەو کۆلکە زێڕینەیـە لە ئامێز بگری و بە خۆتەوە ڕایمووسـێنی، ئەوا توانیوتە ژیان دەسـتەمۆ بکەی و بە ئاواتەکەت بگەی. بەو کارەش دەتوانی بچیتە ڕیزی خوداکانەوە.»

قاقایەکـی بە کوڵی ژنانەش، بـەردەوام چڕنووقی لە دڵی ماننا دەگرت و تەتەرەیەکی مەرگاوی لە ناخیا دەنایەوە ...

* ئەم چیرۆکە دوابـەش و درێژەبووی دوو چیرۆکی «تەتەرەی دڵی ماننا» و «ماننا و سەفەرێکی خۆخواز»ە

## میراتگر

■

هەموو شەوێ، هاوکات لە گەڵ بوومەلێڵی ئەستێرەپەڕاندا، بە دەفرێکی نەخشێندراوی ئاڵتوونیەوە، کە لێوانلێوو و تژی بوو لە ترس و خۆف، هەڵیدەکوتایە سەرم، پاشان بە هێمنی و زۆر بە وەستایی و بێ ئەوەی دڵۆپێکی بە فیڕۆ بدا، ڕۆی دەکردە گەروومەوە. نەمدەناسی. حەزم لێبوو، دەمامکی ڕووخساری هەڵماڵیبا و بۆ تەنیا جارێ چاوم بە چاوی کەوتبا. بەشکوو بمزانیبا ئەو کەسەی بێ وچان و بە کاوەخۆ، هەموو شەوێ، لە سەرووبەندی ئەستێرە پەڕاندا، لە لاشانی پردە پەین ڕێژەکەی خوارووی شار، بەرە و ژێر دەبووەوە و هەنگاوی دەنایە ناو ئەو پەین و پاڵەی، ڕۆژانە لە سەوەتەکانەوە، هەڵدەڕێژرانە قەراغ چۆمی شار کێیە و مەبەستی لەم کردەوانە چییە؟!

ـ نەخەوتووی؟ گوێت لە منە؟!

گەلێک جار حەژمینم نەدەما و بە تەواوەتی قەراری لێ دەبڕیم و بەو مەراقەوە دەجەڕام، چەشنی زەلامێکی نێو قەد

ئەستووری بێ دەرەتان کە لە تاو ئازار و ژانی گورچیلەی بە مەرگی خۆی ڕازی بێت و بە سەر و کەللەوە بەرەو پیری دیوار بچێ. پەستێو و کونج و کەلەبەرە تار و تنۆکەکانی مێشکم، سیغ ئاژەن دەکرد. پەلم بۆ ژوورە ئاستەنگەکانیش دەکێشا، بەشکوو بێتەوە یادم کە لە چ کاتێکدا و چلۆن منی بێ پەل و پۆ و چڵمەلەتە، هاوردەی بن ئەم سەوەتەیە کرام.

دەنگێك لە نادیارەوە دەڵێ:

- گەوجە گەوج بەسە، لە مێشکتا سۆراغی مەگرە، وەڵامەکەی لە وێدا نادۆزیتەوە، لە ناو ئەو خاکانەوە بگەڕێ، خاک!

دەنگێکی تر دەڵێ:

- مرۆڤی ژیر و زانا لەم خاکە پیس و پەڵۆخ و لە نوێژ چووەدا، بۆ ئەو وەڵامە مەزنە ناگەڕێ. وەڵامی مەزن لە چەنتەی مەزندایە. مەزنترین چەنتەش، ئاسمانە ئاسمان!

دەنگێکی دیکە دەڵێ:

- سەرێ نەیێشێ پیراسکەی لێ نابەستن گەلۆ. کەمت پرسیار هەیە ئەمەشت لێ زیا.

هەر جارێ دەهات، بێ چرپە و بە کاوەخۆ، ساتەوەختێکی کەم بە دیتنی ڕادەچڵەکام و دەچرژام، پاش ماوەیەکی کورت، دەستبەجێ دەهاتمەوە سەرخۆ. هێندەی دووپات کردبووەوە، بە تەواوەتی پێی ڕاهاتبووم. بە نووکی گۆچان، سەوەتەکەی بان

سەرمی بەرز دەکردەوە و دەیهاویشتە ناو زۆنگاو و گەناوی چۆمەکەوە و پلتەی دەهات. ئەوسا دەفرێکی نەخشێنراوی ئالتوونی لە پێچەرۆکی دەسماڵێکدا دەردەهێنا و لە گۆزەڵە مەفرەقیەکەی بن پشتوێنەکەی لێورێژی دەکرد و لێهاتووانە پێی دەخواردمەوە. هاوکات لە گەڵ هەڵقوڕاندنەکەدا و دوای بەرز کردنەوەی سەرم، لام ڕوون دەبووەوە هەمان ئان و ساتە، دەم و زەمەنی ئەستێرە پەڕان. پاشان دەچووەوە سەروەختی سەوەتەکە. لە ناو زۆنگاو و گەناوی چۆمەکەدا، بە یارمەتی گۆچانەکەی و بە ئاوەچۆڕەکەیەوە، دەیکێشایەوە دەر و دەیخستەوە بان سەرم. ڕێک و پێک لە شوێنەکەی خۆیدا و وەک شەوانی ڕابوردوو. لە گەڕانەوەیدا هەنگاوەکانی بێ چرپە بوون، دیار بوو پێ لە سەر پەین و پاڵی ئەو ناوە دەنێت. چەندە پێم گەوج و نەفام بوو، هێند بە ساویلکەیی دەهاتە بەر چاوم و قاقا پێی پێ دەکەنیم. دەزانی چۆن؟ ئاوا: قا.. قا.. قا ...!

قاقا کێشانەکەم لەوەدا نەبوو. دەکەوتمە سەر گازەرەی پشت، پاشان هەڵدەئایسام و پژمین و تڕینیش بە دوویدا. کە دەهاتمەوە سەر خۆ، لێم ڕوون دەبووەوە کە ئەمانە هەموویان خەون و خەیاڵن. خەون و خەیاڵێکی پووچ و بە تاڵ، چەشنی تاقە گوێزێکی ڕواڵەت جوان کە دوای قرچەی شکاندنی بە پووچ دەربچێ:

- بە سەرت قەسەم لەم ژیانە بێ نرخ و سەگ ژیییەما ئەوەندەم گوێزی پووچ شکاندووە، حەد و حەسری نییە!

لە بیرم چوو ئەوەش بڵێم، ئەو زەلامەی تامەزرۆی ناسینی بووم و هاوشێوەی ژنێکی دووگیان موژدیم بۆ دەکرد، گوێزی بۆ نەدەهێنام، بەڵکوو جرج و مشکە ڕەشە ئاوسەکانی قەراغ زۆنگاو و گەناوەکە کێشەوەیان بۆم دەکرد ... ئەوە دەڵێم چی؟ بەڵێ... قاقام دەکێشا، بۆ گەوجیەتی و ساکاری ئەو زەلامە دەمامکدارە. هاتووە ڕێک لە ناو ئەم پەین و پاڵە و لە قەراغ زۆنگاو و گەناوی تەنیشت پردە پەین ڕێژەکەی خوارووی شار، سابات و مەنزڵی بۆ کردووم، وا کە لە بۆن و بەرامەی بۆ گەنیوی پیسایی ئاوەڕۆکانی شار کە چەشنی ڕەشمارگەل، خۆیان دەپەستێونە ناو چۆمی شارەوە، بە وەزاڵە بێم. منی، چڵمە لەتەی زەبوونی بێ پەل و پۆ، ژان بمگرێ و بکەومە سەر پێڵاوە قێزەون و پەیناویەکەی و لێی بپاڕێمەوە و بەزەیی لێ بخوازم؛ قا.. قا.. قا... ئەی چۆن بەو گەوجییەی پێ نەکەنم. بەوەش وازی نەهێناوە و «هەموو شەوێ، هاوکات لە گەڵ بوومەلێڵی ئەستێرە پەڕاندا بە دەفرێکی نەخشێندراوی ئاڵتوونیەوە کە لێواولێو و تژی بووە لە ترس و خۆف هەڵیکوتاوەتە سەرم، پاشان بە هێمنی و زۆر بە وەستایی و بێ ئەوەی دڵۆپێکی بە فیڕۆ بدا، ڕۆی کردووەتە گەروومەوە.» گەوجیەکەی لەوەدایە نازانێ مرۆڤ تەنیا بوونەوەرێکە بە هەر چەشنە بارودۆخێ ڕادێ. هۆی! میوانە خنجیلانەکەم، لە گەڵ تۆمە! بەو پەلکە ساوایەت قەسەم! هەر چوار شەوی ئاستەنگ و بە پەژارەوە بووم. تەنیا چوار شەو و

بەس. ژان بەریدام و پێی ڕاهاتم. ئێستاش تەنیا خەفەتباریم ئەوەیە بۆ تا هەنووکە نەمتوانیوە بیناسم و پەردە لەو ڕازەی هەڵێنم. هیچکات بێ هیوا نەبووم و کە تۆش بوویتە میوان یا خود خانە خوێم، پتر لە جاران ڕۆحی هیوام پرشنگدار و ڕوونتر بووە و لە ڕۆژنەکانی ئەم سەوەتەیەوە، ئەستێرەکان گەشتر لە جاران دەبینم. بە تەمای ئەو ڕۆژەیەم ساقەتەی لەشت هێندە بەرز بێتەوە، ئەم سەوەتەیە وەڕەس بکا و تەنگی پێ هەڵچنێ، چیتر ناترسم ئەم گوێزەشم وەک گوێزەکانی دی بە پووچ دەربچێت.

دوێنێ شەو لە بوومەلێڵی ئەستێرەپەڕاندا، دوای نوێژی بەیانی لە مزگەوتی گەڕەک بە ئومێدی بە سەر کردنەوەی هاتیە دەرەوە. گۆزەڵە مەفرەقییەکەت بردە پەنا گوێت. بە ئەسپایی ڕاتوەشاند. ڕەنگە قومێ یاخود دوا قومی بێ. ڕووت کردەوە پردە پەین ڕێژەکەی خوارووی شار. هەنگاوەکان بە دووتدا نەدەهاتن. ڕەنگە وزەیان دواچۆڕی هاتبێ. بە لارەلار و خێشەخێش گەیشتیتە سەری. بە نووکی گۆچانەکەت، سەوەتەکەت لێ ترازاند. دەفرە ئاڵتوونیە نەخشێندراوەکە لە دەستا لەرزی. دیار بوو تەکانی شەوانت نەماوە.

□□□

... دەفرە نەخشێنراوە ئاڵتوونیەکەی خستووەتە سەر لێوت. مێروولە دەکا. لە ناکاو دەپژمیت. دەکەویە کۆخە کۆخ. وەک باوکێ بە ئاستەم لە پشتی منداڵەکەی بدا، لە پشتت دەسرەوێنێ

و دەڵێ:

ـ یا غەوسی گەیلانی نەخنکێی ڕۆڵە!

هەســـتم کرد باوکمە و بەزەیی جـــووڵاوە. لە چرکەیەکدا قەتیس مانیَ فرمێسک و ســـەرڕێژ بوونیان ڕووی دا. هەناسەم گڕی تێبەربوو. چاوم بە نەرمی کەوتە ســـەر چاوی. نوزمیەک ڕندووەکەی نێوانمانی تەقاند:

ـ بابە!

پەشـــیمانی لە چاوانیا گوورا. چەشنی تۆی پەلکە خورما کە لە ژێر ئەو پەین و پاڵەوە گوراوی و چاوت بە جیهان هەڵێناوە و ماوەیەکە بوویتە میوان یاخود خانە خوێی من. هەر دویَ شـــەو بۆم ڕوون بووەوە دواچۆڕی گۆزەڵە مەفرەقیە نەخشـــێندراوەکەی دەرخـــوارد داوم و خۆی پیَ نەگیراوە و جێی هێشـــتووم. گۆزەڵە مەفرەقیەکە و دەفرە نەخشێندراوە ئاڵتوونیەکەش بە میرات بۆ من مانەوە. دواتریش ئاگادار بوومەوە کە ئەویش وەکوو من، داشـــدار و میراتگری باوکی بووە.

## ورته

■

هەموویـــان خەریکن. لە دۆزینەوەیین. بـــە پۆل و بە جووتە و بە تاک. ســـەرەتا، لە ســـەحراوە دەســـتیان پێ کرد. بست بە بســـتی قاقرترین شوێنی ســـەحرا و بیابانەکەیان کێلا. سەرە و بنیان کرد. تێکەومیان وەردا. گەر ئێوارەیەکی درەنگ، لە ســـەر تەپۆلکەیەکـــی مەیلە و زەردی لم و خۆڵی ئەم ســـەحرایەدا بە دانیشتنەوە، هەژنۆکانت و تەنیاییەکەت لە باوەش نێی و بە وردی و چاوی بۆ کز کـــەی و لە ئاوابوونی خۆر و ڕووبەری کاکی بە کاکی بڕوانی، گۆڕســـتانێکت دێنێتەوە یاد بە هەزاران هەزار گۆڕی بەســـتەزمانی بێ لاشـــەی دراوەوە. تا چـــاو حەتەر کا گۆڕستان و قولک و قەبری دراوەی هەتیو کەوتووی چاوەڕوانی جەســـتەی بێ گیان. کە لە تەنیشتیانەوە و بە مەودایەکی کەم تێپەڕیتایە، هـــالاوی توندی ئارەقەی بـــن باخەڵیان، بێ ئیرادە دەماخی پێ هەڵێبدای. لە پەســـتا و بێ ڕاوەســـتان، خەریکی ژێر و ڕوو کردنی ڕووبەری ســـەحرا بـــوون. ڕۆژێکی دی کە

هاتنـــەوە، هەر کەس بێژنگێ یان هێڵەکێکی دانە درشـــتیان لە گەڵ خۆیاندا هێنابوو. دیار بـــوو قەناعەتیان بەو کارەی دوێنێ نەکردووە. کەوتنەوە پشـــکنین و بێژنگ کردنی سەحرا و بیابان. هێڵەکیـــان کرد. بە کۆ و بە جووتە و بە تاک. نەســـرەوتن. بێ هەدادان. جار ناجارێ لە بن پێیانەوە زرتەی کلکی سرتە مارێ، گوێ قولاغی دەکردن. دەســـبەجێ دەکشـــانەوە و هەڵمەتیان بۆ دەهێنا. سرتە مارەش لە حەیبەتا دەهاتە سەر کلک و پاشە و پاش و شەپۆلا و شەپۆل بەرەودووا دەکشایەوە و دوور دەکەوتەوە. وادیار بوو بەو ئاژەڵیەی، فامی ئەوەی بوو، کە خۆی لە شەڕی خۆترێن ببوێرێ. گەڵێک جاریش بە دەم هێڵەک کردنەوەوە؛ دووپشکێک لە بەستێنی هێڵەکدا دەکەوتە فرتە فرت و کلکی قوت دەکردەوە و دەچوو لە دەســـتیان خۆ قوتار بکا. ئەوانیش دەسبەجێ لە سەر ڕووبەری سەحرا و بازنە ئاسا، ئاگرێکیان دەکردەوە و دووپشکەیان دەخستە ناوەندی بازنەکە. هەموویان لە دەوری خڕ دەبوونەوە و بەم کارەکەیان؛ ماوەیێ پشـــوویان دەگرت بۆ ئەوەی جارێکی دیکە و بە گڕوتینێکی باشترەوە، بکەونەوە سەروەختی پشکنینەکەیان. دووپشـــکە، کە دەرەتان و ڕێی دەربازبوونی نەدەما و چەندین جار ئەمبەراوبەری بازنەکـــەی دەپێوا، بە کلکی و لە ناچاریدا و لە ڕێـــی ژارەکەیەوە خـــۆی دەپێکا. لە چێژی ئـــەم خۆ پێکانەی دووپشـــک، هەموران دەکەوتنە سەما و پلە لێدان و سمت و سۆڵ بادان. ئەمە پیشـــەی هەموو ڕۆژێکیان بوو، تا مەودای سەحرا

هاتــە کۆتایی. کە چاویان هەڵێنا، گەیشــتبوونە بناری زنجیرە کێوێ وێنەی دەستە برا لە پشت یەکتری ڕاوەستابوون.

شــان و مل داگیراو و شل و شــەکەت، چەشنی پەل و پۆ و گەڵا و بەرگی ســیس و بێ ئاوی پــار نەمامێک دەچوون. هێڵەک و بێژنگەکانیان فڕێدا و لە ســەر گازەرەی پشت یەک تەختە ڕاکشان. شەپۆل ئاسا و چیناوچین، ورتەورتێ لەو سەرەوە و دەم بە دەم نێزیک بووەوە. یەک بە یەکیانی گرتەوە تا گەیشتە دوا کەسیان:

- کێ دۆزیویەتیەوە دەنگ هەڵبڕێ ؟!

وەڵامەکە ڕۆیشتەوە.

- کــەس تا ئــەم ســاتەوەختە نەیتوانیوە بیدۆزێتــەوە و تا هەنووکەش لە گەڕان و پشکنینداین.

ڕۆژی دواتــر لە جیا هێلەک و بێژنگ، پاچ و قوڵینگیان داینێ. شــەرتی ببووین. چیتر بیرمان لــەوە نەدەکردەوە، چییە بۆی خۆ کەوتووین و لێی دەگەڕێین. چەشــنی ســەربازێکی گوێڕایەڵ و گۆشکراو، نافەرمانی زگمان پێ نەدەکرا.. ببووینە جەندرمەی ورگمان.. ئەمنیــەی گەدەمان. بەردەوام کارمان لە لەشمان دەکێشایەوە و لە بەر لچمانەوە دەمانگوت:

- دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرە ..!

وەکــوو مۆریانــە، ئاوقای کەژ و کێو ببووین. باســکە و باســک، هەردا و هەرد و ملە و شــاخمان دەپرواند. گەیشتینە

دەروازەی بەردینی ئەشـــکەوتێ. هورووژمـــی جەماوەر ڕوو لە زیادبوونی کرد. بوومەلێڵ و تاریکایی ناو ئەشـــکەوتەکە ببووە هەوێنی گیانمان. دەڵێن:

«ئۆقرە دۆشـــاوی تاریکییە، لانکەی مێشکە و مەتەرێزی ڕۆحی ماندووە»

لە ســـەر دەرگای ئەشـــکەوتەکەڕا بە چەند زمانی کەڕوو گرتوو، نوسراوەیەک بە جێ مابوو. ژەنگارۆ بوو. ڕەنگە زمانحاڵی فینیقیەکان، عیلامیەکان، کلدانیەکان یا خود ئاشوورییەکان بوو بێ. شـــارە زایەک بـــە کاوەخۆ کەوتە لـــەت و لووش کردن و خوێندنەوەی:

- بۆ جیلەکانی دواتر! ئێمە، بە ســـەدان ســـاڵ بێ پشوودان، بســـت بە بستی ئەشـــکەوتەکانمان پشـــکنی. کون و ڕەهێڵ و قوژبنەکانیشمان جێ نەهێلا. تامی ماندوویمان نەزانی. شەونخوون بووین، بەڵام ئاسەوارێکمان نەدۆزییەوە. داواکاری لە ئێوە؛ چیتر پێویســـت بە گەڕانتان ناکا. لـــەوە پتر خۆتان هیلاک مەکەن و «چێو لە تاریکی مەکوتن !»

□□□

... نوێترین و کارامەترین ڕۆباتی ناسا، پێی نایە ناو هەسارەی مەریخەوە. بە تەمایە لە گەشتێکی زانستیدا، لە ئاکامی گەڕان و پشکنینەکەی، بەم زووانە ئاگادارمان بکاتەوە...

دەنگی تەلەفزیۆنەکەی بـــڕی. بۆچرووکێ لە هەناوییەوە

دەرکشا و لە بەر خۆیەوە ورتەیەکی لێ بووەوە:

- تـــۆ ناڵێـــی ئێمە هەڵەیـــن و ئەوەی بۆی بە پەرۆشـــین، چاویلکەییێکە بە سەر لووتمانەوە و لێی دەگەڕێین...!؟

## خەنجەر

■

که له لوتکەی قـــەڵای نژۆوه، هەر چوارمان یەکرپیز و له تەنیشت یەکدی، مەلی نیگامان بەره و دەشتی شاره کۆن هەنارده کرد، له بڵندگۆی مزگەوتی ئاوایی نژۆوه، مەلا له بانگی عەسر دەبووەوە، ســێبەری قەڵا، چەشنی بەستێنی چارشێوێکی تەنکی مـــات، له لێرەواره چـــڕ و پرەکەی دامێنی قـــەڵاوە تا نێزیک ئاوایی، خســـتبووه باوەشی خۆیەوە. شـــەولەبانی دارینەی چەند خانووی گڵەبانی ئاواییش، له بەر خۆرەتاودا، خۆیان هەڵخستبوو و تلیسابوونەوە، وا دیار بوو که تا هەنووکەش له باوێشکی نیوەڕۆ خەوێکی شـــیرین دەرباز نەببوون. هێدی هێدی دوا هەناسەکانی، هەناسە سواری ڕێگا بەره و ژوورەکەی قەڵا، له ئاسایی بوونەوەدا بوو کە؛ ســـواره، مووروونێکی چەور و شیرینی خسته نێوان دوو قامکی دۆشـــاومژه و ئەســـپی کوژەوه و هەڵینا و بە چاوێکی قونجاوەوە، خستییه بەر خۆر:

- کوڕینه چاو له ڕەســـمی ئەم ســـواره کەن، له ڕەســـمی

پادشایەکی بە دەسەڵات دەچێ بە سواری ئەسپەوە. نەخشاندن و بەرجەستە کردنی ئەم جۆرە ڕەسمانە لە سەر ڕووبەرێکی کەم مەودای وەک ئەم مووررووە چەور و شیرینە، لە توانا و تاقەتی خەڵکی ئەم دەڤەرەدا نەبووە، دۆزینەوەی ئەم چوار مووررووە دابەشکراوانەی نێوانمان لە کووپە خوسرەوییەکدا و لە ناو لەوێچێ گڵی هەڵوەریوی لاشەیەێ کە تەنیا مشتێ ئێسک و پرووسکی لێ ماوەتەوە، جێی تێڕامانە. زۆر بە وردی سەرنجی دەندە و پەراسووەکانیم داوە. دوو ئێسکیان جێی ئامێریان پێوە دیاربوو. ڕەنگە بەر هەڵمەتی شمشێر کەوتبن. سەیرەکەی لەوەدابوو، دوای ساڵانێکی دوور و درێژ، چوونکە کووپە خەسرەوییەکە لە بەردەمی هاتووچۆی هەوادا نەبووە و زارەکەی بە وەستایی و لێزانانە ئاخێندراوە، ئێسکەکانی نەبوونەتە خۆڵ و ئێستاکە گێڕەرەوەی حاڵ و ئەحواڵی خۆیەتی.

من وا هەست دەکەم ئەم لاشەیە ناوی هۆزان بووبێ.

. هۆزان! دەڵێن لەشکری مووغەکان وەک ڕەشەبا وان، قەیاسەیان لێ تووند کردووە و بەزەییان بە کەسدا نایێ و پیر و جوان ناناسن و بە سواری ئەسپان، بەرە و شارە کۆن بینراون. کە هاتوو چاوت پێیان کەوت، نەخەڵەتابی خۆیان لێ ئاشکرا کەیت و غیرەت بتگرێ و دەست بە خەنجەر بی. ئەوە شەڕی خۆ ترێنە هۆزان! تا دەتوانی مەڕەکە ڕاونێ بەرە و کەندەلانێ و خۆت لە ئەشکەوتێ، یان ناو شاخێکدا بشارەوە ڕۆڵە گیان.

ڕەنگە دایکی هۆزان ئەمەی پێ وتبێت.

ـ هۆزان! باوکەکەم! دایکت ڕاست دەڵێ، نەخەڵەتابی خۆت لە ناژیری بەی و بکەویە بەر چاویان و جەزمە بتگرێ و خوێنت گەرم بێ. ڕۆڵە، تۆ ئێســـتا تاڵی و سوێری دونیات نەچێشتووە و هەرزەکاری. مووغەکان دەڵێی بای سرسرن، بەردە کل و بەردی مانگیش خۆیان بۆ ناگرن و لە هەڵمەتیان دەرباز نابن.

ڕەنگە باوکی هۆزان بۆ پشـــتگیری قســـەکانی دایکی، ئەمەی وتبێت.

ـ هۆزان! چاو ڕۆشـــنی و دیارییەکم لە بن تاتەکەی کانی چەوەندەران بۆ داناوی، دوێنێ کە لە مەڕی گەڕامەوە، بە بۆنەی قومە ئاوێکەوە چوومە سەر چاوگەکە و لە ژێر تاتە نوێژەکەدا، جێم هێڵا. لە بەر خاتوون و ئەســـمەر، دەستم نەتگەیشتێ، تکات لێ دەکەم هۆزان! هۆشـــت بە خۆتـــەوە بێ. دەڵێن مووغەکان لە کونە ماران دیتراون. بێ بەزەیین هـــۆزان! بەرەنگاریان نەبیتەوە. نیشتمان، هەناسە سارد و بێ کەسە و چاو لە ڕێتە.

لە پشـــت گوێســـپانەکەی ئاغەڵەکەیانەوە کـــە کەوتبووە باکووری شارە کۆن و سەر ڕێی مەڕێ، نیشتمان، دەستی ڕووە و ڕۆژ هەڵێنابوو و دووعای لەش ساغی بۆ هۆزان کردبوو.

بـــاوەڕ هێنان بەوەی کە؛ ڕۆژێ لە ڕۆژان، هۆزان دەســـت بـــە خەنجەر بوویێ و یـــەک لە دوای یەک، لـــە بەرەنگاریدا مووغەکانی کەلەلا و شـــەق و شڕ کردبێ، جێی گومانە و پتر

هەڵاتـــن و دەربازبوون لەو جەنگەی لێدەوەشــێتەوە و لە ڕاســتی نزیکترە، بەڵام لە زاری سۆیی خولەی مەقام بێژەوە و بە حەیرانێ و بە ســۆز و فوغانێکی جەرگبڕەوە، شتێکی دیکە دەردەچێ و ئاوقای دڵ و ڕۆحت دەبێ:

«ڕانەکەی لە دۆڵە قاقــرەوە بەرە و لووتکە و ملەی بەردە مانگی هەڵدەکێشــا. لە تەپــی قۆرغێوە دەنگــی بلوێرەکەی دەبیسترا. دوای دیتنەوەی دیاری و چاو ڕۆشنیەکەی نیشتمان، لە ژێر تاتەکەی کانی چەوەندەران، دڵ و هۆشـــی هۆزان بارگە و بنـــەی تێک نابوو و ئاوقای هەواری دڵ و خەیاڵ ببوو. دەیان جار لمۆزی لە تاتەکە خشاندبوو و بۆنی پێوە کردبوو و بە زمانی لســـتبوویەوە. دواجار ماچی کردبوو. بـــۆ ماوەیەک مەڕەکەی لێ دوور کەوتبـــووەوە. ئەو پێنج مووروووە، کـــە دواتر یەکیانی لێ داکەوتبوو؛ یاقیق، شـــەوە، زەردوویی، تانە و ئەبڵەق، چەور و شـــیرین، دانە بە دانەیانی خستبووە سەر پێڵووی چاوانی و پاشان بۆنی پێوە کردبوون. ئەوســـا چووبووەوە سەر وەختی ڕانەکەی و ڕووەوە بـــەردی مانگ هەڵزنابوو. مووغەکان و بای سرســـڕ و ڕەشـــەبا وێرانگەرەکەی، لەســـەر کانی جێ هێشتبوو. دەتگوت ئادەمـــە و دوای تەنیایی و چاوەڕوانییەکی مەرگاوی، حەووایان کردووەتە دیاری بۆی و بە دیتنـــی تەواوی ئامۆژگارییەکانی ڕابوردووی خۆی لە بیر کردووە. مەست و ئاژیرە و بووەتە پێڕەوی دڵی و چووەتە سەر وەختی دارسێوەکە. دەڵێن:

«کە خۆشەویستی دێ، عەقڵ کلکی دەنێتە بن هەنگڵی و ڕیسوا دەبێ. مەرگ، بارگەوبنەی خۆی تێک دەنێ و ڕوو لە مەملەکەتی نادیار دەکا. قەڵەمی ئەژنۆی ترس دەشکێ و قرچەی ئێسکەکانی ڕۆژەڕێیێ دەڕوا. کە خۆشەویستی دێ، دیزە و کووپە شەڕابان بە پوولێ، بە قرۆشێ. حەیا و شەرەف بە دیناری، بە تاقە ماچێ. گەنجی شاهان بە بزەیەک و بە لەتەرێ. کە خۆشەویستی دێ، لاولاو، لە زستاندا باڵا دەکا. گولێ لە کەلاوەکەیەوە، هەنگاو دەنێتە ژێر لێزمەی باران و گۆرانییەک بۆ ئاو، ئاوازێ بۆ زەریا دەچڕێ. سەیرە، چیتر شادانەی ناوێ، وەلای دەنێ و مەست و کەلەلا دەخوێنێ و دەجریوێنێ...»

- «خەنجەرەکەت بۆ کەی هەڵگرتووە؟!»
- «بۆ تەنگانە»
- «گەوجە جا لەمە تەنگانەتر؟!»
- «حەوبرا، نابینی ئەوان چەن سوارن و منیش پێخاوس و خەنجەرە لەتێ!»
- «ئەی وەفا و مەردایەتیت کوا قارەمان، لێت بترازێن تا دەشتی شارەکۆن و دەم بانیژەی ماڵی نیشتمان، ناگیرسێنەوە، هەک داوەشێی پیاوە چکۆلە!»

... پاش ئێوارەیەکی درەنگ وەخت، جەستەی بێ گیان و خەڵتانی خوێنی هۆزان، لە تەنیشت لاشەی چوار مووغدا لە لاسەرووی کانی چەوەندەران، لە دۆڵە قاقر کە دواتر بە

«جەمووغە» ناسـرا، دۆزرایەوە. لە مشـتیدا، چوار مووروویان دیتەوە، کە لە سەر یەکیان وێنەی پادشایەک بە سواری ئەسپەوە، نەخشـێندرابوو. ڕەنگە وێنەی سـوڵتان جەلالەدینی خوارەزمشا بووبێ...

خەنجەرە دەسـک ئێسـکەکەی هۆزانیش، کەوتبووە لای یەکێ لەو چوارکەسەی لە سەر قەڵاوە دەیانڕوانییە شارەکۆن، بە تەماشبوو تا تەنگانە نەبێ، ئاشکرای نەکا...

# DNA

■

تازە دوای ئەوەی ئەم کارەساتە خولقا بیرم کەوتەوە کە کچەکەم چەند جار پێی وتووم: مەکە بابە! و دەست بە دامێنم بووە: ئامان بابە! دەبێ زۆر وریا بی. دەمێکەیە لە دڵی داوم موقەدەرێکت بە سەر دێ، دڵم ختوورەی داوە. خەوم پێوە دیوی. ئەوەندەی من بزانم تووشی شەو کوێری بووی و چاوەکانت حوکمیان کەم بووەتەوە. تکات لێ ئەکەم نەخەڵەتابی بە شەودا بە ئۆتۆمبیلەکەت سەفەر بکەی. خودا نەخواستە فەرمانت لە دەست بچێ و بکەویتە هەڵدێرێ، یا شیو و دۆڵێکەوە، یاخود لە ئاژەڵێکی بسەرەوێنی، تازە جێی خۆت ناگریتەوە و منیش بە بێ باوکی دەمێنمەوە.

لە سەرەتای بادانی سلفی ئۆتۆمبیلەکەوە، تا دە کیلۆمێتری بەرە و دەرەوەی شار و ڕووە و دەشتی سوورێن و شریخەی شیشەی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە، فشەم بە قسەکانی دەهات. پێم گاڵتە بوو. هەنیشکی دەستێکم خستبووە سەر فەرمانی ئۆتۆمبیلەکە

و کایەم بە سمێڵەکانم دەکرد. بە دەستەکەی دیکەم فەرمانم گرتبوو. بە خەیاڵیشما نەدەهات ڕۆژێ لە ڕۆژان، کچە موو خورمایییە شەش ساڵانەکەم، کەزیەی کەروێشکانە بەسترابێ و بە ئەلەنگ و دولەنگ بێتە لام و چاوی بە چاومەوە هەڵواسرێ و گوێ لە قوورەی سکم بگرێ. هەست بە شتێ بکا کە منی باوکی، تا ئەو ساتە وەختە قەت بە زەینیشما گوزەری نەکردبێ. ڕەنگە ئەوەندە ئیمانم بە ئاستی هوشیاری و پلەی زانیاری خۆم بووبێ کە ئەم خۆویستیە کوێری کردبێتم، یا ڕەنگە خۆرکە لێیدابێتم و لە ناوەوە خەریکە دەمپروێنێ. شێر پەنجەیە، بەرەبەرە و بە ئارامی و لە ناخمەوە بێ ئەوەی بە خۆم بزانم، بن کۆڵی کردووم و لە ڕەونەقی خستووم. هێزی دیدەکانمی نەهێشتووە و خەریکە لە خشتەکم دەبا. نەمدەزانی منداڵی ئەم زەمانە هەر لە زگی دایکیان بەر بوونەوە، یەکپارچە ئاگرن. هەر بە ساوایی پلاک و زنجیرێکیان لە ملدایە و لێی نووسراوە:

«دوا پلەی زۆر زانی!»

قەدیمی وتەنی:

«قسە یا لە شێتی ببیستە یان لە منداڵ»

ڕێک لە تەمەنی کچەکەما بووم، کە شەوێکیان باوکم بە نەڕە نەڕ و پێلەقە کوتان، کەوتبووە گیان دەرگای حەوشەکەمان. دایکم سەری لە پەنجەرەی ڕووی کۆڵان بردبووە دەرەوە و هیسی لە باوکم کێشابوو. ئاماژەی بە دەر و دراوسێ و خەڵکی گەڕەک

دابوو کە سـەعات پێنجی بەیانییە و هەر تۆی دەڵێی گورگی و شـەونەخەوی. نابینی هەمووان لە شـیرین خەودان. باوکیشم داهۆڵ ئاسـا لە دەم دەرگا ڕاوەستاوە و بۆگەن و بۆساری گوواو و لیتاوەکەی لە دووریشەوە دەماخی بە دایکم هەڵخستبوو. چەن کەوتبـووە گیان دەرگاکە، دایکم لێـی نەکردبووەوە، تا کەوا و پانتۆڵ و پشـتوێنەکەی و کەوش و گۆرەویەکانیشـی لە دەم دەرگا و لە کۆڵان پێ دانابوو. پاشـان هاتبووە ژوور و تا خۆی کردبوو بە حەمامدا، بە سـەد کفرەوە یەقی دابووەوە کە خەتای مزگەوت و مەلای گەڕەکە لێخەم نابنەوە و دەیانەوێ شەو نوێژ و جەماعەتی بەیانیشـم نەفەوتێ. ساڵیانی ساڵە خەڵکی گەڕەک و مامۆسـتا و خواش دەیزانێ، بە دەگمـەن ڕێکەوتووە، نوێژی بەیانیم فەوتابـێ و ئەگەر بە دووعا و پاڕانەوە بوایە، نەدەبوو بە عومری حەیاتم تووشی ئەم شەو کوێریە ببومایە. لە بەر خاتری هاتووچۆی مزگەوتیش بووایە، بۆ دەبوو من بەم دەردە بچم. ئاخر خوا چۆن قبوولیەتی، من بەم چەشنە لە تاعەت و عیبادەت کردن بکەوم و ئاوا ببم بە قەشـمە جاڕی خەڵک و بنێشـتە خۆشەی سەر زاریان. وام بە سەر بێ کە ژنەکەشم لێم تەوەلا ببێ و بێز و بۆم لێ بکاتەوە. تا لە کۆڵان و لە بەر چاوی دەر و دراوسـێدا، ڕووت و قووتـم نەکاتەوە، دەرگام لێ هەڵنەگرێ و ئیزنی هاتنە ژوورەوەم پێ نەدا.

کە بە خاولیە ڕیشاڵ ڕیشاڵە زەردەکەیەوە لە حەمام هاتبووە

دەر، پێی نابووە ســەر دەستم. منیش بە ســەر و چاوی ئاڵۆز و تێک ترشــاوەوە لە خەو ڕامابووم. بە چاو هەڵگلۆفینەوە ببوومە گوێگــری پرتە و بۆڵەکانی باوکــم. کە چۆن لە دوای نوێژی جەماعەتــی بەیانی لە مزگەوتەوە ڕووی لــە ماڵ کردووەتەوە. هێشتا ڕێگایەکی دوور و درێژ و پێچاوپێچی کۆڵانەکانی ماوە بیبڕێ تــا بگاتە ماڵەوە و بحەوێتەوە، هەســتی کردووە چاوی تاریک داهاتووە و لە ڕەشــەوە دێ و بەر پێی خۆیشــی ناتوانێ ببینــێ. لە تاریکــی کۆڵانا پەلی کوتاوە و لە حاســت ماڵی حاجی فەرەجەوە، مەجبــوور دیواری ماڵەکانی کردووە بە ڕێنما و چاوســاغی خۆی. لە بیری چووەتەوە کە زێرابی ماڵی حاجی فەرەج پێشــتر تەقیوە و باڵا پیاوێ هەڵیانکەندووە و داویانەتەوە. تێسی دەکەوێ و بە پەلەقاژە و پەل کوتان و بە هەزار یاغەوس و یا کاکە ئەحمەی شێخ تا لە ناو گواو و لیتاوی زێرابەکەدا دێتە دەرەوە.

جوان لە بیرمە کە سەرە تاسەکەی و کوونی گوێچکەکانی بە لەچکی خاولیەکە وشــک دەکردەوە و لە ژێر ڕووناکی لامپە زەردەکەدا، شەبەقی ئەدایەوە و تف و نەحلەتی باوکی دەکرد. کە چۆن ئەویش، شەوێکی ســەهۆڵبەندانی زستان، پێش مەلابانگ دان، بەرە و حەوزەکەی مزگەوتی ئاوایی بۆ غوســڵی شەرعی لە ماڵ دەچێتــە دەر. لە مزگەوتەکــەدا، دوو حەوزییان دەبێ. یەکیان پان و بەربڵاوتر لەوی تر و تایبەت بە دەســنوێژ و ئەوی

دیکەیان قووڵتر و کەم مەوداتر و بۆ غوسڵ و دەرکردنی لەش پیسی بە کار دەبرا. باوکی کە دەگاتە بەر مزگەوت و لە چوونە ژوورەوەدا، لاقی لە قەراغ تاتە نوێژەکە دەگیرێ و سەری بە لێواری حەوزەکەدا دەدرێ و دەپێکرێ. زمان پێکا نادا و دەسبەجێ دەمرێ و شۆڕ دەبێتەوە و دەخزێتە ناو حەوزەکەوە. کە خەڵکی ئاوایی بۆ نوێژی بەیانی ڕوو لە مزگەوت دەکەن، لاشەی شەلالی خوێنی لە ناو حەوزەکەدا دەدۆزنەوە، کە دەمە ونخوون و بە پشتا و بە سەر ئاوەکەوە باسکی بڵاو کردووەتەوە و کەوا و پانتۆڵە دووڕەنگەکەشی ماسیوە. دواتر لە زمان دایکی بیستووە کە؛ باوکی ماوەیەک بووە لە دەست شەو کوێری ناڵاندوویەتی و سکاڵای کردووە و ئەو شەوەش لە بەرئەوەی بەیانی نوێژەکەی نەفەوتێ، لە ماڵ چووەتە دەر. مووقەدەر بووە کە بەم شێوە موبارەکە و لە ڕێی «حی علی الصلوه» دا گیانی لە دەست بچێ و بە شەهید لە قەڵەم بدرێ. بە بیری باوکیشم تا ئەم ساڵانەی دواییش ژنی حامیلە و بە زگ و زاوە، کە فارغ نەدەبوون، ڕاسپاردەیان دەنارده لای دایکی باوکم و داوای لەتێ بەندوخوێنیان بۆ تەبەڕووک لێ دەکرد. بەو نییەتەی خاوەنەکەی ساڵح بووە و خوا شەهادەتی بە نسیب کردووە. بەشکوو ببێتە دەلیلی شەفا و ئەو ژنە ژانگرتووەی پێ دەرباز ببێ. دایکی وتبووی بێجگە دووجار، ئەویش چون درەنگ لەتە بەندووخوێنەکەیان فریا خستوون، جارەکانی تر بووەتە مایەی شەفا و لە دایک بوونی

کۆرپەیەکی سەر زل و قەڵەویچکە.

... کە هاتمەوە سـەر خۆ، لەوانەیە بڵێم پێنج گەزێ بەرزتر لە ئۆتۆمبیلەکە بە حەواوە ئەشـەکامەوە. دەسـتم بۆ سکم برد، ڕۆ چووە ناوەوە و لە پشـتمەوە هاتە دەر. بەرە دەسـتەکانم خستە سـەر ڕوومەتم، هیچ هەسـتێکم نەبوو. بـە دەوری خۆمدا بە تەوژم خوولامەوە. سـووک و بێ کێـش. نە دڵە خورپەیەک و نە بێقەراریەک. مژێکی تەنکی نەرمی پەموو ئاسـای بەردەوام لە شـێوە گۆڕیندا. قریومیەکم لێ بووەوە. سـووڕێکم بە دەوری ئۆتۆمبیلەکەدا لێدا. ئاراسـتەکەی گەڕابوو. تەنیا لامپی لای ڕاسـتی سـاغ مابوو و نەکوژابووەوە و ڕووناکی خستبووە سەر پێدەشـت و دارسـتانەکەی قەراغ جادەکە. گابەردێکی سەنگ چەخماخی سپی جەستە، خۆی هەڵدابووە بەر ئۆتۆمبیلەکە. تاق و تـەراق تریفەی ڕووناکیەکی کەم تین لـە خانە باخەکانەوە، وێنەی تابلۆیەکی نیوەکاری سـەر بوومی شێوەکارێکی وەڕەسم پیشـان دەدرا. لە ناو ئۆتۆمبیلەکەدا، ڕاننده‌یەک بەدی دەکەم. خەڵتانی خوێنە. بە شـەوکوێری و لە شارەوە، لە دەست تەنیایی هەڵاتـووە و ویسـتوویەتی خۆی لێ قوتار بکا. سـەری ناوەتە سـەر فەرمانی ئۆتۆمبیلەکەی و باڵەکانی ڕوو لە خوار، شۆڕ بوونەتەوە. بەزییم پێیدا دێ. دەمهەوێ بچمەوە لای و دوودڵیشم. دڵم سـاغ نابێتەوە. دەڵێم بە مەرجێ بچمەوە لای، بەڵێنیم پێ بدا، چیتر لە دەستم ڕانەکا و بێهودە هەڵنەیێ ...

## تا لێی دەی دەڕی

■

دەنگی ڕەقی سەندەڵەکانی وەزیر، لەرزە دەخاتە دڵمەوە. ئەم داڵانە دوور و درێژەی قەسر، قەت تەواو بوونی نییە. لە ئەشکەوتێ دەچێ؛ کەس نەگەیشتووەتە دوا قەراغەکانی. بڵێی:

- هۆ!

چەند جار دەڵێ:

- هۆۆۆۆ!

بڵێی:

- هێ!

چەند جار دەڵێ:

- هێێێێ!

تا دێ، دەنگەکە نزیکتر، بەڵام بە تەوژمتر و بەرزتر و بەربڵاوتر دەبێتەوە، وەک کەسێ ڕۆحم بابۆڵە کا و ژێر پێڵاوەکانی نێ و هەوڵی پلیشاندنەوەی بدا و بە قینەوە تاکەوشەکەی لە سەری وەرسووڕێنێ و بێنەوبەرەی پێ بکا. دەزانم ئەمجارەش، دێتە لام و

لە حاڵێکدا لەپی دەستەکانی بە نیشانەی ڕێز و حورمەت لە سەر نافەکی گرێداوە و لارەمل و بە ئەسپایی لە چەمینەوەدایە، دەڵێ:

- پاشا سـەلامەت بێ، ئەمجارەش هەوڵەکەمان بە نەزۆکی مایەوە، قوربان! سایەتان لە سەری میللەت و جەماوەر، موستەدام بـێ، دەرفەتێکی دیکە بەم حەقیری دەرباره عینایەت بفەرموون، بەڵێـن بێ ئەمجارەیان دواجـاره و ڕێ چارەیەکی بۆ دەبینمەوە. دەلیلی کهوولەت و هەڵگەڕانی تەمەنە، دەڵێی خەڵفاوم و مێشکم کرم تێیداوە. شـەرتە ئەمجارە ڕووزەردتـان نابم و تا تینم مابێ، فەرمانەکانی حەزرەتی جاە و مەقام بە جێ دێنم و دەبمە مایەی مەزاح و سـرووری دڵە گەورەکەتـان. بەڵێن بێ لەو بێ قەراری و یەکبینیەی ژیان دەربازتان دەکەم و لە ئەنجامدا دەبمە سـینە چاکی دەم دەرکەتان. چاوەڕوانی ئەوامری حەزرەتی سوڵتانم.

بـەڵام نا، ئەم جاره فریوی فێڵ و تەڵەکەکانی وەزیر ناخۆم و تەسـلیمی وەعد و بەڵێنیـە درۆ و دەلەسـەکانی نابم. دەبێ جەربەزەی خۆمی پێ نیشـان بـدەم و بیکەمە عیبرەتی خاس و عام. دەبێ دەسـتووری تاشینی سـەر و ڕدێن و سمێڵی بدەم و بەر و دوا، بە سـواری گوێرێژێکەوە، کۆڵان بە کۆڵان و شەقام بە شـەقامی قەسر و شـاری بیگێرم و بۆ هەتا هەتایە هەتکی بکەم. دەبێ بە میللەتی ئەم مەملەکەتەی نیشـان بدەم کە هەر کـەس و لە هەر جێگە و مەقامێکدا، لە هەوڵی ئەوەدابوو گاڵتە بە فەرمانەکانی شـاهانە بکا یا بەو جۆرەی پێویسـتە بایەخیان

پێ نەدا، بە توندترین شـێواز سـزا دەدرێن و سووک و چرووک دەکرێن. پاشـان حوکمی لە سـێدارەدانیان بۆ دەر دەکەم. دەبێ خەڵکی لنگە فرتێکەیان ببینن بە سەر سێدارەوە و لە حەیبەتانا تا چەندین شەو، تەنانەت نەتوانن وەنەوزیش بدەن. لە بیرم نەچووەتەوە سێ ساڵ لەمەو بەر لە کاتی دەسپێکی نەخۆشیەکەمدا بە پەلە ناردم بە دوای وەزیردا، عابایەکـی زێڕ بافتی کەنارە ئاڵتوونی لەبـەردا بوو. هێنامە قـەراغ تەختی شـاهانە و جێگەیەکم بۆ تەرخان کرد. کەمێک شـەڕابی تایبەتـی خۆمم بۆ ڕۆ کردە ناو پەرداخێکی زێڕەوە. بە سـەلامەتی سەرم هەڵیقوڕاند. پاشان سـەر و لووتی شۆڕ کردەوە و بە هەمان شێوەی هەمیشەیی، لارە مل وێستا و چاوەڕوانی عەرایزم بوو. لە دوکتورەکانی کۆشک هەواڵی نەخۆشیەکەی منی پێ گەیشتبوو، کە کرمێکی دوور و درێـژ لە ناو دڵما گرمۆڵـە بووە و دەمی لە لاپەڕەکانی نێوی ئاژەنیوە. تـا هەنووکە یەک لە سـێی پارچەکانی دڵمی کرم ئـاژەن کـردووە و ئەگەر زوو فریای نەکەویـن ئەوا بێ هیوا و بێ چارە دەمێنینەوە و زەلیل و عەلیل، دەبینە قەشـمەجاڕی ژنە لە ئەژمار نەهاتووەکانی حەرەم سـەراکەمان. بە تایبەت شەهێن، شاژنی گەورە کە دەمێک سـاڵە بە هۆی هەوێ تازەکانییەوە، بینـم لێ دەخواتەوە و لە دەرفەتـێ دەگەڕێ وەکوو هیندی ژنە عەرەب قەفەسەی سـینگم بقەلاشێ و جەرگ و دڵم بکاتەوە و دەمی تێبنێ. بەڵام وەزیر ئەوەی نەزانیبوو کە چارەسـەری ئەم

نەخۆشـــییە بە چی دەکرێ. بۆیە پاش ئـــەوەی تێمگەیاند کە دوکتوورەکان گوتویانە؛ تەنیا چارەســـەری ئەم نەخۆشیە، خەفە کردنی ئەو کرمەیە، بە لێسەندنەوەی ئاسوودەیی، بە دەربڕینی لە ڕادەبەدەری هەســـتە جۆراوجۆرەکان، بە چەشنێ کە لە ئاکامی چێژ و هەستیار بوونێکی فراواندا دڵمان بماسێنێ و زەختی تەواو بخاتە ســـەر کرمەکە و لە ئەنجامـــدا، ببێتە هۆی دڵ تۆقین و خەفەبوونی ئەو کرمە خوا نەناســـە کە لە هیچ شوێنێکی دیکە، جێی دەســـت نەکەوتووە و ڕێک و پێـــک و بە بێ ئیزنی خانە خـــوێ، هاتووە و لە ناو دڵی منداماڵی کردووە. برۆکانی حەوا خســـت و بە تێڕامانەوە تێمفکری. بڕێک زیاتر لێم ورد بووەوە و تارەکانی گەرووی کەوتنە لەرە:

- سەر و گیانی وەزیر لە ڕێتاندایە؛ ماوەیەکە دوای بیستنی ئەم هەواڵە جەرگبڕ و ناخۆشە خوێنی شادەمارەکانم بە سەختی لە هاتوو چۆدان. دۆشـــداماوم کە من تا ئێستا لە کاری حوکمی و ناحوکمیدا و لە ژێر سێبەری ئامۆژگارییە بە نرخەکانی جەنابی حەزرەتی سوڵتاندا کەمم نەهێناوە و هەمووکات بە سەرکەوتوویی بە ســـەر کەند و کۆسپ و گرفتەکانی مەملەکەتدا زاڵ بووم و چارەســـەری حەکیمانەم بۆ دیونەتەوە، دەبێ لەم گرفتەشدا وەک ڕابووردو لیاقەت و شان و باڵی خۆم نیشان بدەم و نەبەزانە بکەومە ئەزموون و تاقیکردنەوەی هەموو ڕێگاکان و تا دۆزینەوەی ڕێگا چارەیـــەک هەدا نەدەم و نەحەســـێمەوە. ئەگەر جەنابی پادشـــا

ئیزنیان لە سەر بێ تا سپیدەی سوبح، بە دەستی پڕەوە دەگەڕێمەوە حوزوری موبارەکتان.

ئەو شـــەوە تا ســـپیدەی سەحەر لە ســـەر یەکێ لە قەڵا و باڕووەکانی قەســـرەوە، لە چێو و شەمامیلە فەلەکییەکانم ڕوانی، ئاژەڵ بـــە دوای ئاژەڵدا. هەر کامەیـــان کاتژمێرێ کەم و زیا ســـەرقاڵیان کردم. بە دەوری دیوارەکانی کۆشکا دوور و نزیک، پرشـــنگی کەم تین و بێ گیانی ماڵە ڕەعیەت و وەرزێرەکان، لە ئاســـمانێکی دیکە ئەچوو بە هەندێ ئەستێرەی پەرش و بڵاوەوە. بۆنی ئاســـوودەیی دووکەڵی کولانکە ئاگری خانووەکانیان بێ قەراری دەخستە ناو دڵی پاسەوان و ئاژەنەکانی دەوری قەسرەوە، لە گەڵ ســـریوەی پەنجە کێشی نێوان گەڵا وردە شۆڕەبییەکانی سەرسەرای کۆشک و بارەگاکەش.

سپیدەی سەحەر، لە تالاری قەسر، لە سەر تەختی پاشایەتی، پاڵم نەدابووەوە کە؛ دەنگی ســـەندەڵەکانی وەزیر، شریخەی خستە ناو کۆشـــکەوە. گەلێک بە دەنگەکەیـــان وڕەزم. پەردەی گوێم هیچ، پەردەی دڵیشـــم ئازار ئەدات. گەلێک جار ڕێ کەوتووە؛ ویستوومە دوای گەیشـــتنی وەزیر، داوای لێبکەم قۆندەرەکانی بگۆڕێ، تا لەوە زیاتر مەزاجی شـــاهانەمان تێک نەدات، بەڵام هەر جارە و بە هۆیەکەوە لە یادم چووەتەوە و ڕەنگیشـــە کێش و گیرایی دەنگ و ســـیمای وەزیـــر، بووبێتە هۆی لە بیر کردنی. دوای گەیشـــتنی وەزیر، کە لێم ڕوانی؛ کۆترێکی دوو ڕەنگی

شـــابالْ سپیم هاتە بەر چاو، سپی و خۆڵەمێشی. جار ناجاریێ بە نیشانەی ئەدەب و ڕێز سەر و دەنووکی دەلقاند و پاشان بە دەنگی بەرز دەیگماند:

- جەنابیَ حەزرەتی ســـوڵتان موســـتەدام بن، ئەم حەقیرە بێ ئۆقرە و قەرارەی ئێوە، لە ماوەی شـــەو و ڕۆژی ڕابوردوودا، بەم ئەنجامە گەیشـــتووم کە؛ مادام تاکە ڕێگەی چارەسەریتان، بە لێسەندنەوەی ئاســـوودەییتان دێتە ئەژمار، کاتێ ئاسمان بڕیاری لەم چەشـــنە بە ســـەرتاندا دەســـەپێنێ و بە تاکە ڕێگەی ساغ بوونەوەتان دەژمێردرێ، ئێمەش دەتوانین ئەم عینایەتەی ئاســـمان بقۆزینەوە بۆ بەســـتێن و باوەشـــی خەڵک، بەو جۆرە کە ئەگەر میللەتەکەمان بێ قەراری باڵیان بە ســـەردا بکێشێ، ئەوا پادشا و گەورەی وڵات، تا دوا چارەســـەری ئەم باروودۆخە پێکهاتووە، ناتوانێ ئاســـوودە بمێنێتەوە و هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ماساندنی دڵی جەنابتان و خەفە بوون و دڵتۆقینی ئەو کرمە لاسار و دزێوە، کە تاکە هۆکاری چارەسەری نەخۆشیەکەتانە. ئەگەر حەزرەتی جاه و مەقام، ڕاتان لە سەر بێ هەر لەمڕۆ و بە فەرمانی شاهانە و لە تالاری قەســـرەوە، ئاگاداری دەردەکەیـــن و جاڕ چییەکان دەنێرینە شار و گوند و ئاوایی و تەنانەت کۆخەکانیش، بە هەموو چیـــن و توێژەکانی خەڵك ڕادەگەیێنین کە لەم پاییزەدا، وارياتی کۆشکی شاهانە لە یەک بە شەشەوە، دەبێتە دوو بە شەش و بێ ئەم لاولا و لە کاتی دیاریکراودا و وەکوو ســـاڵانی ڕابووردوو، لە

سەر پردە بەردینەکەی شار وەردەگیرێت، ئەوەشی پێ زیاد کەین کە؛ هەر نافەرمانییەک سزای توندی هەیە و بۆ جاری یەکەم دەست بە سەراگرتنی ماڵاتەکەیەتی و بۆ دووهەم جاریش ماڵ و زەویەکانیەتی. جەنابی پادشا! ئەمە ڕێگەیەکی شیاوە تاکوو دەنگی نەیاران و ناحەزان و یاخیبووەکان هەڵبڕێ و ئێوەش بۆ سەرکوتکردنیان بکەونە هەوڵ و تەقەلا. بەو پێیە پلەی لێدانی دڵتان بەرز دەبێتەوە و ڕێخۆشکەرە بۆ هاتنە دەرەوە لەم ژیانە ئارام و دووپاتکراوە و زایەڵەی ژیانتان دەگۆڕدرێ. متمانەشتان بێ ئەم بیرۆکەیە، کاردانەوەی باشی دەبێت لە سەر حاڵ و ئەحواڵی بەرێزتان.

ئەم داستانە، سێ ساڵی ڕەبەقە دووپات دەبێتەوە و هەر جارە و لە پاییزدا و لە سەر وەختی خۆیدا، جەماوەر هورووژمیان هێناوە و لە سەر پردە بەردینەکەی شار، وارپاتی شاهانەیان پێشکەش کردووە و هیچ کات، ڕێ نەکەوتووە؛ قرمە و هەڵایەک ساز بێت و سوپای تایبەتی شاهانە بکەوێتە سەرکوت و قەڵاچۆیان. ئەوا سێ ساڵ لەو دەسپێکە تێدەپەڕێ و هەر جارەیان وەزیر بە عابا زێڕ بافتە کەنارە ئاڵتوونیەکەی و سەندەڵە ڕەقەکانیەوە لە هاتووچووی تالاری قەسردا بووە و ڕا لە گەڵ ڕا پێی زیاتر لە ڕۆحم ناوە و ڕەنگە تا گەیشتووەتە ئێستا بە ئاستەم نووزەیەکی مابێ. هەر ساڵە و بەشێکی بە وارپاتی شاهانە زیاد کردووە و تا هەنووکە، گەیشتووەتە چوار بەش، لە شەش بەش و ئەمجارەیان

یەکی چینیێ دارکاریشی لە گەڵە، کە وەزیر ئەمڕایە؛ دەروازەی هومێدی بەڕووی ئەو دارکارییەدا کردووەتەوە. هەمووساڵێکیش بە تەمای ئەوە بووم هەرا و هۆرایەک ساز ببێ و منیش ببمە تاکە بڕیاردەر و دیدەوانی لنگە فرتێی لە دار درانی دەنگ هەڵبڕ و یاخیبووەکان. بە جۆرێ تا سەر ئێسقان کەیفم پێی بێ و دڵم هەڵایسێ و چیتر لەم دەردە بێ دەرمانە خەلاسیم بێ. دوکتورەکانیش وتوویانە؛ بە پێی زانیارییەکانمان تا ئێستا، دوو بەش لە پارچەکانی دڵم کرمۆڵە بووە و تەنیا دوابەشی ماوە و ئەگەر، زوو فریا نەکەوین؛ ئەوا تەنیا حەسرەتباری بۆ گەلەکەمان دەمێنێتەوە. بۆیە ئەمجارە کە وەزیر پێی ڕاگەیاندم لە دواچینەکانی جەماوەرەکەوە کە لە سەر پردە بەردینەکەی شار ئاپورەیان داوە، هەڵا و قرمە ساز بووە و لە دوورەوە لە یاخیبوونێکی جەماوەری دەچێ، زوو وەفدێکم بە سەرپەرشتی وەزیر، بۆ ڕوون بوونەوەی بارودۆخەکە و دانووستاندن لە گەڵیاندا، ڕەوانە کردووە و کەمێ ئۆخژن بە دڵم گەیشتووە و وا دیارە ترپەی دڵم لە بەرزبوونەوەدایە. بەڵام تا وەزیر ئەم داڵانە دور و درێژەی قەسر دەپێوێ، کە لە ئەشکەوتێکی بێ کۆتایی و بێ کەنارە دەچێ، لەوانەیە من؛ نیوە گیان ببم.

وەزیر، دوای ساڵیانی ساڵ، دەگاتە تەنیشت تەختی شاهانە، هەر دوو لەپی دەستی دەنێتە بان نافەکی و لێکیان گرێ ئەدا و لارەمل و لە ژێر لچیەوە دەکەوێتە گۆ:

ـ قوربان! سەر و ماڵم بە فیدات بێ، ئەمجارەش ڕیسەکەمان بووەوە بە خوری!

ـ چۆن؟

ـ یاخیبوونێکی جەماوەری لە ئارادا نیە!

ـ ئەی؟

ـ تەنیا داوای ئاژەن و پاسەوانی زیاتر دەکەن، دەڵێن؛ ڕێژەیان کەمە و فریامان ناکەون و درەنگ بەڕێمان دەکەن...

* بۆ بیرۆکەی ئەم چیرۆکە؛ یارمەتیم لە بابەتێکی فۆلکلۆر خواستووە.

## ٣ دار

■

لە گەڵ لێدانی تەشوێکەی، نرکەیێ لە هەناوییەوە، دەپژماند و دوواتر، بە زەبری نووکەکەی، تەڵاشەیەکی لە لەشی دارچنارەکە دەپچڕاند. نرکە و جیرە.

... ڕاسپاردەی قۆپچە زیوەکەش، قۆپچەکانی زیو بوون. لەو ماوە کەمەدا، پێنجت لەسەرڕا بۆ خوارەوە و دوو دانەشت، لە سەر گیرفانەکانی بژاردبوو. یەک، دوو، سێ، چوار ...

ـ لە کوێی هۆمەر؟ گوێت لە منە کەڕ و کاس؟

ڕاسپاردەکە، بە دەم و فلّچ و زاراوەیەکی توورکییەوە، ئەمەی پێ وتبوو. پاشان هۆمەر، پاشەوپاش هاتبووەوە لای خۆی و گوتبووی:

ـ لە من بێ خەم بن، بەڵێنیم داونێ و لە سەر قەولەکەشم، ڕۆحم دادەنێم، بەڵام ئێوەش پیاو بن و لە ژێر قەولەکەتان دەرمەچن.

بەڵێنی بە ڕاسپاردەکە دابوو، تا کاتژمێر دوازدەی شەو، داواکارییەکەیان ئامادە بکا و لە گەرووی خاکدا هەڵینێت. لە

گەڵ تەکانی تەشـــوێکەی، پوزوولکەی ئـــارەق، لە ژێر لوێچی جامەدانە کۆن و ڕەنگ ڕۆیشتوەکەیەوە، ڕووە وخوار دەخلیسکێ.

«بێ ئۆقرەیە و نازانێ، لە گەرمانە یا؛ لە شەرمان!»

- «هۆمەر! ئەمجارەیان، مێســلێ جارەکانی گوزەشـــتە نییە، تەواو خۆتی پێوە ماندە و خەســـتە بکە، دەبێ زۆر مەحکەم و سفت و قەوی دروستی بکەیت. سەری ئەم دەفعە بوزورگە هۆمەر، زۆر بوزۆرگە و پاداشتیش چەورە، چەورر!»

شوێنی کەســـپ و ماڵەکەیان، پێکەوە بوون. کە لە ناوچەی فەیزووڵا بەیگی، لە تەک خورشـــێ ژنـــی و لە دەردی گزیری و ســـەپانی و گاوانـــی هەڵاتبوون، لێرە بە نـــاوی دارتاش، خۆی گیرساندبووەوە. هەر زووش، دەم بە دەم لە ناو خەڵکیدا، بە هۆمەری دارتاش ناوی دەرکردبوو. لە تاو ئەوەی دەســـت و پێوەندی ئاغای ناوچەی خۆیان نەیبیننەوە بە ئاشکرا دووکانی دانەنابوو. قەناعەتی بە حەوشەی ماڵەکەیان کردبوو. لە بەرەوە، هەر نرکە و خنەی بوو، هەڵبەتە پیشـــەیەکی قورس و وەستایانە نا، بەڵکوو هێندێ کاری سووک و سانا کە بە هەر کەسێکت بسپاردبایە تا ڕادەیێ شارەزایی هەبوو. دوای ئەوەی شار لە لایەن پۆستاڵپۆشە قۆپچە زیوەکانەوە، بۆ دووهەمجار، دەســـتی بە سەرا گیردرا، جارناجارێ، بە نهێنی و لە ترسی بۆڵەبۆڵی خورشێی ژنی وڵامی داخوازیەکانی ئەوانیشی، هەر چەندە بە نابەدڵی دەدایەوە. خورشـــێ کە تووڕە دەبوو، جەزمە دەیگرت و تا ئەو سەری کۆڵانەکەیان، دەنگی هەڵدێنا:

ـ خودا لە ئەزەڵەوە هەر بە سەپانی لە قووڕی کردووی، هەر بە بـێ عورزەیی لە گڵ ڕاهاتووی. ئەگینا خەڵکی بۆ هەموو دەبێ ماڵ و حاڵی باشـیان هەبێ و ئێمەش؛ ڕوومەتمان بە شـەپلاغان گەش ڕاگرین. هەک پشتت شـکێ بۆ ژیانێ بەرهەمت هێناوە. یارەبی لەوە کەر و کاس تر بی هۆمەر!

گەلێک جار هۆمەر وای لێدەهـات بڕیارێکی نەخوازراو بدا و سـەری هەڵگرێ و ڕوو لە هەندەران بکا. بەڵام کە دواتر بیری لـە منداڵەکانی دەکردەوە؛ خۆی بە خوێڕیێ دەهاتە پێش چاو کە نەیتوانیـوە منداڵەکانی بە خێو بکا و جێی هێڵاون. ئەوکات هێور دەبووەوە و ئاوری ناخی دەتلیسایەوە. کوێخا وتەنی:

ـ «وەکوو دەستی کەر، دەکەوتە عەرزێ!»

خورشێ بە دەستێکی کەشەفەیێ و دوو چایی و قەندانەیەکی گڵی لە سەر و بە دەستەکەی دیکەی، دامێنی کراسە پڕ چین و لۆکەی گرتبوو و هاتە حەوشێ و چووە سەر وەختی هۆمەر:

ـ هۆمەرخان! ماندوو نەبی! کەیفت سـازە مێردە قۆزەکەم؟ چ دەبوو تـۆش ناوت هۆمەرخان بووایە و خاوەنـی کوێخا و گزیر و گاوان و بوویتایە. ئەوجار بە جووتە و بە سـواری ماینێکی قەدەم، بچووینایـە بازارێ و بە بەر چاوی عالەمـێ و لە بەر دووکانی سولەیمانە جووەی خشڵ فرۆش، ڕامانگرتایە و بچووینایە ژوورێ. دە دانـە گۆبـەرۆک و چوار دانە لاگیرە و پێنـج دانە ژێر چەنە و شـەپلاغە و گوارە و پاوانە و سەر پشـتێن و دونیایەک، شتی

دیکەمان بکرِیایە، ئەوسا من دەبووم بە؛ خورشیدەی تابان، ژنی هۆمەرخان و ڕەشیدی جاجان و خانەکەی خانان. هۆمەرخان! بۆ گوێم بۆ ناگری کەرِوکاس! دەڵێی بۆ داروپەردووی ئەم ناوە قسان دەکەم. هەر لە ئێوارەوە کە ڕاسپاردەکە، هاتووەتە ئێرە، ئیمانم نەچێ گۆڕاوی و لە هۆمەرەکەی جاران دەرچووی. دەبێ بۆنی دەوڵەمەندیت کردبێ. ڕەنگە لە بیری ئەوەدابی کە؛ پاداشتەکەت وەرگریت و توورِمان هەڵدەی و برِۆی ژنێکی دیکە مارە بکەی. قەدیمی بۆیە گوتوویانە: «کورد، هەر دەستی بە دەمی گەیشت و دەوڵەمەند بوو، لە خودای یاخی دەبێ و چیتر بە هیوای مەبە؛ یا زەلامان دەکووژێ یان ژنی مارە دەکات...» شەرتە بە شەرتی خودا، ئەگەر پاداشتەکەت وەربگری و نەمبەی بۆ دووکانی سولەیمانە جووەی خشڵ فرۆش و بە دڵی خۆم ڕازیم نەکەی، وەک عوزارە شێتی باپیر ئاغای، گرِ لە گیانم بەر دەدەم و ڕووسیای دونیا و قیامەتت دەکەم. جا جوان بیری خۆتی لێوەکە و بیکە ئاڵقە و ئاوێزەی گوێکانتی بکە، هۆمەر خانی دارتاش!

خورشێ دوایین قسەی بە دەم هەستانەوە کاتێ تەواو کرد کە ژیلەمۆی ڕوخساری، باوەشێن دەکرا. دەرکە داری وەتاغەکەشی بە دووای خۆیدا، بە ڕقەوە پێکدادا.

لە کۆتایی کارەکەیدا، لە دەلاقەکەوە؛ چاوێکی بە ناو ژوورەکە و منداڵەکانیدا خشکاندبوو. لەوێشەوە بە خورشێی وتبوو؛ تا کۆتایی ڕێ و ڕەسمەکە و وەرگرتنی دوا شاییەکانی پاداشتەکەی

ناگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. خورشێش بە زەردە خەنەیێ ڕەزامەندی خۆی دەر بڕیبوو.

... لەگەڵ سـێ چوار کەسی ڕاسپاردەی قۆپچەزیوەکە، لە چەقاندن و هەڵنانی دوا دارەکە بووبوەوە. کزەی شەماڵی شەوێکی مام ناوەنـدی خاکەلێوە دوای ئارەق کردنەوەیەکی بێ وچان، لەرز کەوتبـووە هەناویەوە. تەنیا لە بوومەڵێڵدا و لە سـەر تەپۆلکەیێ ئەژنۆکانی لە باوەش نابوون و چەناگەی خـستبووە سـەریان و لە هەیبەت و باڵای بەرهەمەکەی خۆی دەڕوانی:

. «هۆمەر! ئەمجارەیان مێسـلێ جارەکانی گوزەشـتە نییە. تەواو خۆتی پێوە ماندە و خەستە بکە ، دەبێ زۆر مەحکەم و سفت و قەوی دروستی بکەیت. سەری ئەم دەفعە بوزورگە هۆمەر، زۆر بوزۆرگە و پاداشتیش زۆر چەورە، چەورا!»

غەڵبە غەڵبێ بە سواری شـەماڵ، گەنە مووەکانی گوێی، نەرمـاژەن دەکرد و بە بێ خولـق کردن، خۆی دە کردە خانەخوێیێ مێشکی:

. کوڕینە سـەیری بەژن و باڵام کـەن، چ دارێکتان دیتووە هێندەی من قیت و قۆز و رێک و پێک بێ؟ دارتاشـەکەمان لە ناو هەر سـێکماندا منی بە برا گەورە داناوە، برا گەورەیی لە خۆڕا نابێ. ئەرکی زۆرتری لە سەر شانە. دەبێتە کۆڵەکەی ماڵ. نابینن من چۆن بوومەتە کۆڵەکە بۆتان!

. کوڕە، کەم فشـەفش بگرەوە، لەوەتـی هەڵنراوی، یەکبین

زمانت ناوێستێ، دەڵێی؛ ئاشـــە ئاوییە دەسوورێ. بەردەوام دەڵێی: بەژنم وا، لاقم وا و کلکم وا! عەیبە پیاو باســـی خۆی بکا، یەکێ لە نیشـــانەکانی پیاوی گەوج و نەزان بە خۆدا هەڵوتنە. لە کۆنەوە گوتوویانە: «درێژ ئەقڵی لە کۆشیدایە!»

- پیاوی چاک بن، دوو قســـەی باش بکەن، هەک داوەشێی بـــرا چکۆلە! ئەرێ ئەو ورتە ورتەت لـــێ چیە؟ کەم ڕژد و چاو چنۆک بە برا، تاکوو ئێســـتا لە ناو ئێمە دا، بێ حورمەتی بە برا گەورەمان نەکراوە، گەورە و چکۆلەیی هەر ماوە. ڕاســـتە دەڵێن: «پیاوی کورتە باڵا و گولەکە شەو و ڕۆژی حەوت جاران لە عەبد هیچ، لە خوداش یاخی دەبێ!»

ســـەری هەڵبڕی. گوێی هەڵپەســـارد، جگە لەو سێ دارەی بەرهەمـــی چەنـــد کاتژمێر هانکە هانک و مانـــدوو بوونی بوو، کەســـی دیکەی بەر چاو نەهات. تەزووێکی سارد، ویبرەی خستە هەناویەوە؛ «تۆ بڵێی لەم جۆرە کاتانەدا، دارەکانیش وە قســـە بێن، بسم الله ...!»

دونیا لە ڕوون بوونەوەدا بوو. ســـەرەتای پێو قەدەمی گزینگ لە خۆرهەڵات ڕا.

دەنگێ نەدەبیسترا بەڵام دەیگوت:

- «کوڕینە! دەزانن ئێمەش، ناومان چووە ناو ناوانەوە!»

لە ماڵەوەش خورشـــێ، لە جێوبانەکەیدا، دەتلایەوە و خەونی بە ژێرچەنە و لاگیرە و پاوانەوە دەبینی ...

## تۆزاڵ

■

چل ســاڵ لەمەوبەر، کەرتی ونبووی پازڵەکەی دۆزیبووەوە و بە سەرجەم مامۆستا و پسپۆڕەکانی ئەم بووارەی ڕاگەیاندبوو، بــەڵام کەس تــا ئەمڕۆ و دوابــەدوای بە ئەنجام گەیشــتنی توێژینەوەکان، ڕاشکاوانە نەیانتوانیوە، ددان بە حەقتانیەتی بوونی ئەم دوا کەرتەی پازڵەدا بنێن...

□□□

دەرەجەی ســی ســیەکەی لە دوو تێپەڕانــد. زەرداوەکەی هەڵکشاندە ناو سورونگەکەوە. چوارشەممۆی ڕابووردوو، کاتژمێر ٧:١٣ خولەکــی ئێوارە بوو، دوای خوێندنــەوەی ناوی لە لایەن مونشیەکەوە، بە گرێ قامکەکانی تەقولبابی کرد و دوای چوونە ژوورەوە، هەســتی کرد، چوارپایەی تەنیشــتی دوکتور، هێشتا هەر گەرمە. نیگای وەکــوو تیغێکی عەمەل، چەقییە بزەی لێوی دوکتور. ئەوەندەی دیکە زۆپای ناخی بڵێسەی کێشا. پەنجەکانی خستە ناو یەک و قامکە قولەکانی کەوتنە هەڵسووڕان. هاوکات،

ئەژنۆی چەپیشی کەوتە لەرە.

- بەڵێ گیانە؟!

سـێوی گەردنی، بە زەختەوە، هامووشۆیەکی کرد، ڕەنگە زەمەنـی ناو گەرووی، تەمووز بێ لە سـەحرای سـینا یا خود بیابانی لووت.

- دوکتور گیان! بە ڕاستی ماندووم. هێز و تەکانم لێ بڕاوە. قەرارم نەماوە. چیتر نایکێشـم. باسـکەکانم دەڵێی بە گۆشپاچ کوتراون و شین و ڕەش هەڵگەڕاون، گۆشتەکەیان هەلاهەلا بووە. مەحز بۆ ڕەزای خودا؛ چارەیەێ، فکرێ، ڕێ حەللێ...

□□□

... کە پسپۆڕەکان، کۆڕێکیان بۆ ڕاگەیاندنی دۆزینەوەی ئاڵقەی ونبووی ئەم زنجیرە گێڕا، دۆزێرەوە کۆنەکەی؛ یەکێک بوو لە بەشـداربووە بانگهێشـتکراوەکانی ئەو ڕێ و ڕەسـمە جیهانییـە. هاوکات لە گەڵ پێشکەشـکردنی ئاکامی ڕەهای توێژینەوەکان، دوای چڵ ساڵ لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردنی شێلگیرانە و تەرخانکردنی ناوی یەکەم پێشکەشـکەر لە سەر ئەو ئەنجامە، هەنیسکی دا و فرمێسکی شادمانی هەڵڕژاند...

□□□

... دڵە خووڕپێی بوو. شـەلاڵی عـارەق. بە چاوپێکەوتنی زەرداوی ناو سـورونگەکە، هێڵنج بەرۆکی پێ دەگرت و شەپۆلی بە لەشی ئەدا. لەوە دەچوو؛ گیانی لە ژێلاوە لە گەڵ خۆی بێنێ.

گەلێک جار، تا بن لەوزەکانی دەیهێنا. لە دەربیجەی زارییەوە؛ سەرە تاتکێی دەکرد و دەکەوتە چاوشارکێ.

- مزگێنیم دەرێ عەبدوولکەریم، هەواڵێکی خۆشم پێیە!

سەرلەنوێ، سێوی گەردنی، بە دژواری هەڵگەڕان و داگەڕانێکی کرد. بزەیەکی کەم تین و بێڕەنگیش، گوڵە زەردەی نیگای وەک گوڵە بەڕۆژە، کردەوە. لە ناو دەمی دوکتورەوە؛ یەک لە دوای یەک، سکەکەی تەڵا بەردەبووەوە سەر موزاییکە پێنج خشتەکیەکان. زرینگەیان دەهات و لە سەر لا گلۆر دەبوونەوە بۆ ژێر مێزەکەی. دەیویست؛ داموکێتەوە و بیانچنێتەوە، بەڵام لە تاو هەواڵەکە، بڕست و جووڵەی لێ بڕابوو.

- دوکتور گیان! خۆم لە خۆمدا، کەلەلام. تکات لێ ئەکەم لەوە کەلەلاترم مەکە و دیسانەوە مەمجەڕێنە. مادام هەواڵەکە لەم وەزعە ئەسەفبارە دەرم بێنێ، شەرت بێ بە دڵی خۆت ڕازیتدەکەم.

- عەبدولکەریم! باش گوێ بگرە، ئەم شەو کاتژمێر ١٠ ی شەو، بە دیار هەواڵەکانەوە دانیشە و بە وردی سەرنجیان بدە. وەڵامی خۆت وەردەگری. وەک بیستوومە؛ مادەیەک دۆزراوەتەوە، لە سەداسەد، نەخۆشییەکەت چارەسەر دەکا. ئومێدت بە زاتی پەروەردگار بێ. ئەم چەند دەرزییەت بۆ دەنووسم، بەشکم دواجارت بێ نووسخەت بۆ دەپێچمەوە و ئەمجارەیان بە ساغی و سلامەتی بتبینمەوە.

چوبووە ناخی ئەو هەمووە سـککە زێڕەوە کە دانە بە دوای دانەدا لە زارییەوە دەپەڕینە دەرەوە و بەردەبوونەوە و زرینگەیان دەهات. سەری سووڕمابوو لەو نەهێنییە کە؛ بۆ تا ئێستا دوکتۆری بەم چەشـنە نەبینیوە و چۆنە؛ ورگی بووەتە کانگا و خەزێنەی زێڕ و پەیتا پەیتا چەشـنی تەرزەی بەهاری؛ دەکەونە سـەر ئەو مۆزاییکە پێنج خشتەکیانەی ژێر قۆندەرەکانی...

□□□

... لـەوە دڵنیابوو کە تەرخان کردنی تەواوی سـاڵەکانی تەمەنی، بۆ گەیشـتن بەم دەرەنجامە، بێ کەڵک و بێ سـوود نەبووە و بە ڕاگەیاندنی ئەم پێشکەشکارییە، مرۆڤایەتی؛ لە تەم و مژی زانیاری زانسـتی و فیزیکاڵی سەرەتاییترین پێکهاتەی بوون دەرباز دەبێت.

«گرێکوێرەی ڕازی بەدیهاتنی بوون لە ئەزەلدا».

ئـەم کەرتە ونبووەی پازڵی فیزیای بوون، ناوی: «تۆزاڵی خودا»یە!

□□□

... ناوی تۆزاڵی خودا، هەرای خستە مێشکیەوە. لە دەروونەوە خرۆشا. سورونکە ئانسۆلینەکەی ئاوقای تەلەفزیونەکە کرد. لە کونترۆڵەکە گەڕا... ئەی ئەگەر تۆزاڵی خودا، چڵ ساڵ لە ئەگەرا بووە و ئەمێستا بڕیاری دۆزینەوەی دراوە، بۆچی لە ڕابوردوودا؛ خـەروار خـەروار دەق و تۆمـاری کورت و درێـژی مێژوویی و

ئایینی، لە بەستێنی مرۆڤایەتیدا هەڵقووڵاون و ملیۆن ملیۆن بنی بەشەریان پێ لێخوڕیوە؟!

کونترۆڵەکـــەی بۆ نەدۆزرایەوە. جگەرەیەکی داگیرســـاند و بێ دەســـەڵات، لە سەر تراسی نهۆمی ســـەرەوە گیرسایەوە. لە ڕووبەڕوویدا، لەودیــو گۆمبەزی مزگەوتـــی گەڕەکەکەیانەوە، مانگ قایم کرابوو. بانگبێژێ لە دووڕڕا، تازە دەیویست؛ خەڵک بانگهێشـــت بکا، بۆ نوێژی خەوتنان. شـــاریش باوێشکی دەدا و تەمای بوو لە سەر پێخەفی خاک ڕابکشێ و دەستی بکا بە سەرین و لە حەوتەوانە و گەلاوێژ بڕوانێ ...

## تەرمێک بە سەر دەستی درۆیەکەوە

■

تـــۆخ تۆخ مـــردووی، کەچـــی نکۆڵی دەکـــەن و دەڵێن؛ نەمـــردووی. بە ڕۆژی ڕووناک و لە بەر تیشـــکی تیژئاژەنی نیوەڕۆژی تەمووزی ســـینادا درۆ دەکـــەن. وەکوو کۆن نەماوە، بە ئەســـپایی و لە مەشـــکەدا و کوولەکەدا درۆ بکەن، دەنگ هەڵنەبڕن، کە درۆشیان کرد، لە شـــەرمان ببزرِکێن. هەنووکە؛ بە بڵیندگۆ درۆ دەکەن، پڕ بە بۆشـــایی کۆڵان، شـــەقام، شار و وڵاتـــەکان، هاوار دەکەن، دەقیرِێنن، دەقیژێنن، دەڵێن؛ نەمردوویت و درۆ دەکـــەن. لـــە ڕوو ناچن هیچ، مێشـــیش نابێتە میوانیان. تەرمەکەتە، گۆرەوشار دراوی و هێناویانە لە پشتیەوە چێوێکیان کردووە بە کۆڵەکە و هەڵیان ناوە، پیشـــان خەڵکی دەدەن. دەڵێن نەمردوویت و دیســـانەوە؛ درۆ دەکەن. زەق زەق چاوت داپچڕیوە و زارت بە قەد زاری نەقەیەک کردووەتەوە. لارەمل وەســـتاوی. ئاوێنە؛ تەمی هەناسەت ناگرێ و شارەگت بە تربە ترپ، هومێد بە ڕۆحت نابەخشێ. کەچی بۆ سەدان جار لە ڕوو ناچن و دەڵێن؛

نەمردوویت و درۆ دەکەن. هەندێ جار منیش گومان دەمگرێ و پرسیارێ؛ وەکوو بۆربلینگ لە ناو کاسە سەرما هەڵدەخولێ. دێت و دەچێ و دێت و دەچێ... باشە ئەگەر ئەمە جەنازەی تۆیە، بۆ تا هەنووکە بۆگەنی نەکردووە و کرمەڕێژ نەبووە و دەعبا و مێرو و نەکەوتوونەتە گیانی؟ بێ ڕۆحە و نەماسیوە و نەگەنیوە؟ لە دوو ڕۆژ پتر، بۆنی لاشـە، دەبێتە خولوێرکەی مێشک. کەچی بە درێژایی تەمەنـم، بوویتە خانە خوێم و هاوەڵێ بۆ چرپەکانم. کەس نەزانێ تۆ دەزانی؛ ڕۆژ و شـەوم لێ نەبواردووە و بەردەوام بۆ سـوکنایی دڵم دێمە لات و گرێکانی سفرەی دڵم دەکەمەوە. چەشـنی ژنێکی دەسـت بەتاڵی بێ هاوەڵی پشت تەلەیفوون یا پیرەپیاوێکی لێکەوتووی تەمەن حەفتا ساڵ بەرە و ژوور، بە دڵ تامـەزرۆ بێ یەکێک گوێی بۆ بگرێ. دۆ و دۆشـاو تێکەڵ نەکەم. لە هەموو شـتێ دەدوێم. لە فرمێسـکی ئاو و تنۆکی بـاران، لە تەڕ بوونی باڵندە بێ لانەکان. لە مەلی بەهەشـت و شەمشـەمە کوێرە. لە دایک، لە خاک، لە زەوی. لە ئاسـمان و بـاوک، لە پەرژین و قەفەزەی جوڕە. لە پانتایی دڵەوە تا بەر تەسکی عەقڵ. لە قوڕنەکانی دونیا. لە بیدایەتەوە تا کۆتایی.

«تێکیەوە دەدەم چەشنی؛ شێوی مجێورێکی قانعی لە خوا ترسی ئاوات مردووا!»

سەدان ساڵە ڕووبەڕووی من بە چێوێکەوە، بەندیان کردوویت و کاکیلکەت بەر بووەتەوە و ویترینی ذەمت، سـی و دوو ددانی

گڕ دەنوێنی. کەچی دەڵێن؛ نەمردوویت و درۆ دەکەن.

لە یادمە یەکەم جار کە مردیت، ناوەڕاست ڕۆژێکی هاوین بوو. لاشـــەی بێ گیانت بە شانی کەسێکەوە لەرەی دەهات. بن دارە و دار و شـــوێنا و شـــوێنی پێ دەکرا. پەتای سەرگەردانی لێیدابوو. دەستەوەســـتان و بێ ئۆقرە و بێ حەژمین بوو. پەشیمان لەو کەتنـــەی کردبووی و لەوە سەرســـامتر؛ نەیدەزانی چی بە ســـەر تەرمەکەت بێنـــێ. وەڕەز و ماندوو لەبـــن دارە بەنێکدا بە دیار جەنازەکەوە هەڵترووشـــکا. بۆ یەکـــەم جاربوو ترس لە دڵیا شـــکۆفەی کرد، چـــرۆی دەردا و ڕەگی داکوتـــا. هاوتەریبی کوشـــتنەکەت؛ دڵی ماسی. هەستی کرد، دەف کوت دەکرێت. دڵە تەپەکەی دەیلەراندەوە. وەکوو کەســـێکی فێلێهاتوو؛ جار نا جارێ ڕایدەتلەکاند. لێرەدا بوو؛ کە تەنیایی، دەرفەتی لێ هێنا و خۆی خزاندە ناو دەمارەکانییەوە و بووە خانەخوێی ناودڵی.

«هەرکات تووشـــی دڵەکوتێ بووی، بیر لە تەنیایی وەکە. گومانت نەبێ، ئەوە، بە ئیشتیای خۆی ئەسپەکەی لینگ داوە، ئامبـــاز بە دەفەکە بووە و ئایەتی بێـــزاری و بێ قەراری و بێ دەرەتانی دەخوێنێت»

نەیدەزانی چـــی لەو تەرمە بـــکا. دەور و بەری پڕ بوو لە لوورەی گورگ و مرەی چەقەڵ. داڵە کەرخۆر، تەنوورە ئاســـا بە ســـەر ســـەرییەوە دەخولانەوە. لە گەڵ هەر پۆمپاژێکی دڵی؛ گولوبولی تەنیایی لە جیهانی وجوودیا، دەستیان دەگرت؛ بە سەر

ڕەهۆڵ و کەلەبەرەکانیشدا و دەسەڵاتیان میخ ئاژەن دەکرد. چاو نەترسانە ڕۆ دەچوونە ناو مێشکی هەر ٢٠٦ ئێسقانەکانیەوە.

چاوی لە سەر هەرا و جەمبەڵی دوو قشقەڕە ئارامیان گرت. بە قەستی کوشتن کەوتبوونە گیان یەکتری.

«کوشتن لە ئەزەلەوە بەشێکی دانەبڕاوەی بوونەوەرەکان بووە، تەنانەت پەلەوەر و مەلەکانیش!»

یەکیان بە سەرکەوتوویی لە گۆڕەپانی جەنگێکی خوێناویدا هاتە دەرەوە. ئەوەش قەدەری ئەو قشـــقەڕەیە بوو کە بە دەســـتی هاوەڵ یا هاو ڕەگەزەکەی خۆی لە نیوەڕۆژێکی ســـوورەوەبووی هاوینێکی قاقڕدا بکوژرێ! پاشـــان بە دەوری لاشەکەیدا، سێ چوار جار باڵەکانی لێکدا و سنگ و موسەڵدانەی هەڵهێنا و بە تـــەوژم و بە گوڕ کەوتە؛ قاڕە قاڕ. وادیار بوو؛ شاهەنشـــاش بە سەپان ناگرێ. دواتر بە دەندووکێ و چنگۆڵەکانی کەوتە گیان زەوی هەڵکۆڵین. لێی سەرخۆش بوو. دواجار دەریدا. پاشان لاشە بێ گیانەکەی خزاندە ناوی و داپۆشییەوە و دای لە شەقەی باڵ و کەوتە شوێن چارەنووسێکی نادیار.

ئاوێکی ســـاردی بە لەشیا کرا. هەر تۆوی پەشیمانی کەم بـــوو، ئەویش لە ناخیـــدا گوورا. لـــە پەلەوەرێکیش کەمتر بوو. تەرمەکەی بەردەمی؛ تامی سوێری فرمێسکەکانی چێشت. داڵە کەر خۆرەکانی ئاســـمانیش گوێیان لە قوڵپەی گریانی بوو. لە ساتەوەختێکی کەمدا بە قەد سەد ساڵ چەمابووەوە. بڕستی نەما

تەرمەکە چاڵ بکا. بە کاوەخۆ و هەنیسکدان، کەوتە چاڵکردنی ئەو جەنازەی بۆ خۆی کوشتبووی...

... لـــە چاخەکانی دیکەشـــدا و تا دونیا بـــە دونیایە، تا داڵە کەرخـــۆر و گورگ و چەقەڵ بوونیـــان هەیە، من ناتوانم شاهیدیت بۆ نەدەم کە بەم دەستە لەرزۆک و پەککەوتانەی خۆم نەمکوشتووی. نەک کەڕەتێ، ســـەدان کەڕەت. کەچی دەڵێن نەمردوویت و بە عامی ئاشکراش درۆ دەکەن ...

## کۆنترین ئازاری ئەم شانشینە

■

چ شـــتێک لەوە جەرگ بڕترە کە ماوەیەکی دوور و درێژ، ئازارێ لە ناوەوە، بـــە هێمنی بن کۆڵت بکا و بتکا بە پرپۆڵە و هەڵتپروێنێ و نەشـــتوانی بە هیچ جۆرێ دەری ببڕی. مەراقێ بینە قاقات بگرێ و بتهێنێتە ســـەر دەروازەی فوغان و هەڵچوون. دڵـــت لە چێوە بەرێ و بیشـــەمزێنێ، بەڵام ڕێـــی ئەوەت نەبێ، گۆناکانت بە ســـوێراوی فرمێســـکەکانت بخەملـــێ و تامە بە سوێکەیان هەڵچێژرێ. دەیان ســـاڵە تامەزرۆی ئەوەم، جارێ لە جاران نزگەرەی هەنیســـکەکانم لە قووڵایی دڵمەوە هەســـت پێ بکەم و مەراقەکانم لە ڕەگ و ڕیشـــەوە هەڵکێشم و فرێیانبدەمە دەرەوە، بەڵام مەخابن ترسێ ناهێڵێ. ترسێ لە مێژ ساڵە سەرتاپای جەســـتەی داگرتووم و بەرگێکی رەشی پێ پۆشیوم. ترس لەوەی کە نەکا دوای هەڵرشـــتنی فرمێســـکەکانم، لووتم بەر بێتەوە و بماسێ و سوور هەڵگەڕێ و پاسەوان و ئاژەنەکانی سەر شەقام و چوارڕێیانەکانی شارەکەم پێم بزانن کە؛ هەنیسکم داوە و گریاوم و

بەم تاوانەوە بمگرن و لە بنا کەپووم هەڵبڕن و ڕەوانەی گرتووخانە و بەندیخانەکانم بکەن.

لەم شـــارەمدا، کەس ناوێرێ بگری. زۆربەی خەڵک چوون دەمێکســـاڵە نەگریاون و فرمێســـکیان هەڵنەڕشـــتووە، هەستی گریانیـــان لە گرێژنە چووە و لە یادگەیان پەڕیوە. هەر لە زووەوە بە بیری دایک و باوکیشـــم نا، بە بیری باپیرەکانم و زۆریش لەوە کۆنتر، پادشـــایەک بۆ خوێندن، گەورەترین کوڕی کە لە دوای خۆی پێ دەنێتە سەر تەختی شاهانە و دەبێتە جێنشینی، دەینێرێتە مەملەکەتـــێ لە باکـــوور. وا باو بووە کە لـــەو مەملەکەتەدا؛ خوێندنی باڵای بەڕێوەبردنی وڵاتیان فێر دەکردن و دوای ئەوەی شازادەکان ئامادە دەبوون بۆ لە سەرنانی تاجی شاهانە، دەگەڕانەوە بۆ زێدەکەیان و چاوەڕوانی مردنی باوکیان دەکرد. ئەم شازادەیە لە گەڕانـــەوەدا و لە گەڵ خۆیدا؛ هاوەڵێکـــی لە مەملەکەتی باکـــوورەوە هێنابوو. لە کاتی خوێندنەکەیدا لە فێرگە، لە گەڵی ئاشـــنا دەبێ و دەبێتـــە هاوڕێی نزیکی شـــازادە. لە تەواوبوونی خوێندنەکەیدا هەست دەکا؛ ئەگەر بە تەنیا بگەڕێتەوە وڵات و لێی دابـــڕێ، لەوانەیە بەرگەی ئەو دوورییە نەگرێ و زۆر بە خراپی بە ســـەریا بشکێتەوە. پێشنیاری پێدەکا؛ لێی هەڵنەبڕێ و نەبێتە ڕفیقی نیوەڕێ و لە گەڵیا بێ و لە دەورەی پادشـــایەتیەکەیدا، ببێتە وەزیری دەستە ڕاست و ڕاوێژکاری یەکەمی شاهانە. وەک گوتوویانە؛ ئەویش داواکارییەکەی شازادە ڕەت ناکاتەوە و بەڵێنی

تەواو لە شـــازادە وەردەگریّ و زێدەکـــەی جیّ دەهێڵیّ و پێکەوە دەگەڕێنەوە بۆ ئەم شانشـــینە. دواتر شـــازادە؛ لە دوای مردنی باوکی و لە کاتی لە ســـەر نانی تاجی شاهانەدا، بەڵێنیەکەی خۆی دەباتە ســـەر و هاوەڵەکەی دەکاتە وەزیری دەستەڕاســـت و ڕاوێژکاری یەکەمی دەربار. وەک دەگێڕنەوە؛ شا زۆر مەدهۆش و حەیرانی ئەو وەزیرە دەبیّ؛ لە زانایيەکەی، لە شێوەزارەکەی، لە ڕەنگی مووەکانی، لە چاوە شینەکانی و تەنانەت زۆر جاریش لە دڵیدا خۆزگە بۆ سیما ئاڵواییەکەی دەخوازیّ کە ئەگەر منیش، دەم و چـــاوم ئاڵواوی بوایە، لە ناو دەســـت و پەیوەندی دەربادا و لە مەجلیســـی ژنانی کۆشـــکدا، زیاتر دەکەوتمە بەر باس و بە چاوێکی تایبەت و جیاواز ســـەیر دەکرام. شـــا، لە لایەکەوە ئیرەیی پیّ دەبرد و لە لایەکی دیکەشـــەوە شانازی پێوە دەکرد و گەڵێک جار ئەمری بە ڕەشنووســـی کۆشکی شاهانە دەکرد و چەندین جار دووپاتی دەکردەوە کە لە نووسینەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژانەی مەملەکەتتدا دەبیّ ناوی ئەو وەزیرە باکوورییە، شـــان بەشـــانی ناوی شاهانە بە پێشگر و پاشـــگری لێوەشاوەوە تۆمار بکریّ، تا لە داهاتوودا و لە نەوەکانی تردا ئەم شـــانازی و کارە گرینگەی شـــاهانە، بە هەم وەرگیریّ و لە بیر نەکریّ. ئەم ڕێز لێگرتن و شـــانازی پێوەکردنە تا شـــوێنێک چووبووە پێش کە؛ وەزیر و ڕاوێژکاری یەکەمی شـــاهانە زۆر جار سەرخۆیانە و بیّ چاوەدێری شا و مەجلیسی شاهانە، بڕیاری حوکمی دەردەکرد و

پاشاش بە زەردەخەنەوە و بە ئامێزی کراوەوە پیرۆزبایی پێ دەگوت و ڕەزامەندی دەردەبڕی و گەلێک جاریش خەڵاتی دەکرد. لە سەر تەختی شاهانە هەڵدەستا و ڕووی دەکردە مەجلیسی شاهانە و بە دەستی ڕاستی تاجە زێڕینەکەی سەری ڕاست دەکردەوە و دەیگوت:

- هەر کەسێ بڕیارەکانی وەزیر بەڕێوە ببا، ئەوا حوکم و ئەمری شاهانەی بەڕێوە بردووە و هەر کەسێکیش سەر پێچیان لێ بکا ئەوا سەرپێچی کردنە لە ئەوامری من و گەورەترین تاوانی کردووە و سزاکەشی مردنە.

دەگێڕنەوە کە میللەت و جەماوەر، بە هۆی بڕیارە یەک لە دوای یەکەکانی وەزیر، تووشی بارگرانییەکی بێ وێنە ببوون، بە جۆرێ کە؛ بۆ سکاڵا و دەربڕینی ئێش و ئازارەکانیان، شوێنێکیان شک نەدەبرد و نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن. ناچار لە پەستێو و ژوورەکانیاندا و دوور لە چاوی ئاژەن و پاسەوانەکان، تێر بە دڵیان دەگریان و مەراقیان هەڵدەڕشت. بەم جۆرە، ئاسوودەییان بە دەروونی خۆیان دەگەیاند و کەمێ لەو بارگرانییەیان کە، شان و ملی پێ داخستبوون و هێز و توانای لێ بڕیبوون، کەم دەکردەوە و ئۆقرەیان دەگرت. ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە دوابەدوای ئەم گریانە پڕ هەنیسکە لوتیان بەر ببێتەوە و سوور هەڵگەڕێ و بماسێ و لە دوورڕا پێیانەوە دیار بێ کە؛ تاوێ پێش ئێستا لە ژوورەکانیاندا و لە بێ دەرەتانیدا فرمێسکیان

هەڵڕشتووە و هەنیسکیان داوە و کۆشی خەمیان لە باوەش گرتووە. گەر سووڕێکت بە ناو شاردا گێڕابا و لە خەڵکی ڕامابای و لێیان وردبوویتایەوە، کەسێکت بەدی نەدەکرد کە لووتی بەر نەبووبێتەوە و سسوور هەڵنەگەڕابێ و نەماسیبێ، لە دووکاندار و حوجرەچی و عارەبانە چیەوە بگرە تا ئاسسنگەر و دارتاش و تەنانەت؛ وەرزێڕ و جووتیارەکانیش. بە هەر کەسێ دەگەیشتی، زوو دەستێکی بە کەپوویەوە هەڵدەپەسارد و لە شەرماندا، دایدەپۆشی و دەیشاردەوە. ماوەیەک لە وڵاتانی دەوروبەردا ناومان بە؛ وڵاتی لووت ماسیوە سسوورەکان دەرکردبسوو. تاجر و بازرگان و گەشستیارەکان کە؛ لە هامووشسۆی دراوسسێکان و مەملەکەتانی دیکەدا بوون، ئەم هەواڵەیان دەهێنایەوە تا؛ کۆشسکچییەکان و وەزیر و ڕاوێژکاری یەکەمی شساهانە، بەمەیان زانی. وەزیر، ئەم بیستنەوەی لا گران هات و بە هێند و بە سسووکایەتی بەرامبسەر بڕیارەکانی خۆی تێگەیسی و بە پەلسە کەوتە هەوڵ و تەقەلا و لە ئەنجامیشسدا، سەیرترین بڕیاری تەمەنی خۆی دەرکرد:

- بۆ سسەرجەم دانیشسستووانی ئەم پاشانشینە بە هەموو چین و توێژێکەوە؛ لەم ڕێکەوتەوە لە هەر شسوێنێکی وڵاتدا، بێجگە منداڵی تا تەمەن پێنج سساڵان، هەر لووت ماسسیوێ، تەنانەت ئەگسەر؛ بە زەرگەتسەش ئەنگێوترابێ و پێسوەی درابێ، مادام بکەوێتە بەر دەسستی پاسسەوان و ئاژەنەکانی حوکومی، سەرەتا و لە جێدا و لە بنەوە لووتی دەبردرێ و پاشسان ڕادەسست دەکرێ

بۆ بەندیخانەکان و تا کۆتایی تەمەنی دەبێتە میوانی مشک و جرجەکان. ئەوەشتان لە بیر نەچێ کە؛ بە هیچ شێوەیەک لەمەودووا پرسە و سەرەخۆشی نامێنێ و هەڵدەگیردرێ. هەر بەم بۆنەیەوە، ڕاشکاوانە پێتان ڕادەگەیەنین کە؛ ئەمە دوا بڕیارە و ئاسانکاری بۆ کەس ناکرێ، گوزەشتمان لە کەس نییە، پیر و جوان لێک ناکەینەوە و هەموان بە یەک چاو سەیر دەکەین.

کۆشکی شاهانە، بڕواری .../.../...

دەگێڕنەوە کە؛ مقۆ مقۆ دەکەوێتە شارەکە و کۆشکی شاهانەش دەگرێتەوە، دەرباریيەکانیش بەم حوکمە سەرسام دەبن. خەڵکی دەیانگوت؛ تا ئێستا مێژوو لەم جۆرە بڕیارەی بە خۆیەوە نەدیتووە و بە سەیر و سەمەرەیان ناوزەد دەکرد. دەیانگوت: مەگەر مرۆڤ دەتوانێ پێ نەکەنێ؟ دەتوانێ نەگری؟ دەتوانێ نەڕوانێ؟ دەتوانێ... ئەم پرسیارانە بە گوێی شا گەیشتنەوە و لە کۆشکە تایبەتەکەی خۆیدا و بۆ ئێوارە خوانێک بانگهێشتی وەزیری کرد. دوای بەزم و ئاهەنگێکی شاهانە، لە کاتێکدا دەفرە ئاڵتوونیە نەخشێنراوە پڕ لە شەڕابەکەی بە دەستەوە بوو، بە لاوژەوە کەوتە سەروکاری وەزیر و لەم بڕیارەی پرسی و بۆ وەڵامی پرسیارەکان گەڕا. وەزیر وڵامدەرەوەیەکی بە توانا بوو:

- قەدەم و پێڵاوی شاهەنشا، سەر پێلوو و گلێنەی چاوم، منی خزمەتکاری متمانە پێکراوی بنەماڵەی شاهانە، هەموو کات هەوڵم داوە بە دڵ و بە مێشک ئەویندار و ئەمیندارێکی

ڕاســـتەقینەتان بم و بە هەموو نرخ و شـــێوەیەک پارێزگاری لە تەخت و تاجی شـــاهانە بکەم، ئایا دەکرێ منی لانەواز و خاکی ژێر پێی ئێوە، بڕیارێکی گرینگی لەم چەشـــنە بە بێ لێکدانەوە دەر بکەم و بیر لـــە دەرەنجامەکانی نەکەمەوە. خاتری حەزرەتی عالی موستەحزەرن کە؛ خوداوەندی سوبحان زۆر لە بەندەکانی بە کەڕی و تەنانەت بە کوێری هێناوەتە بوون. ئەوەش دەزانین کە؛ ئەم بەندە کـــەڕ و کوێرانە لە هەر کۆمەڵگایەکدا ژیابن، بە بێ وەیترین و ئارام ترین کەســـەکان ئەژمێردراون و زەرەریان بۆ هیچ حوکومەتێک نەبووە و بەردیان نەخســـتووەتە ئەستۆندکی هیچ حاکمێکەوە. پادشـــا سەلامەت بێ، هەمووشمان ئەوە دەزانین کە هیچکام لە کارەکانی خوداوەندی ســـوبحان بێ حیکمەت نین و لـــە خۆڕا ڕۆ نەکەوتوون. دوای تێفکرین و وردبوونەوەیەکی زۆر بەم ئەنجامە گەیشتووم کە هەموو ئەمانە نیشانەن و بۆچی ئێمە تا ئێستا نەمانتوانیوە دەرکی پێ بکەین؟ خوداوەندی سوبحان بە ئاشکرا بە نیشـــاندانی ئەم جۆرە کەسانە بە ئێمەی ڕاگەیاندووە کە؛ مرۆڤ ئەگەر کەڕ بـــێ و ئەگەریش کوێر، دەتوانێ ژیان بەرێتە سەر و وەک هەموو مرۆڤەکانی دیکە تەمەنی هەڵکێشێ بۆ نوەد و بەرەو ژوورتریش، دەشـــتوانێ وەک ئەوانی دیکە، نان بخوا و سەردانی مەبال بکا، بەڵام لەوانی دیکە قانعتر و بێ وەیتر و بێ زەرەرتر بێ. خۆ ئێمە داوای کەڕ و لاڵ بوونمان لە خەڵکی نەکردووە، تەنیا داواکارییەکی بچووکمان بووە، ئەویش نەگریانە.

کاتێ مرۆڤ بتوانێ بە کەڕی و بە کوێری بژی، نەگریان، لەوانەیە زۆر ساناتر بێ، ئەمەش تەنیا مەسڵەحەتی شانشین و لە سەرووی هەموانەوە؛ مەسڵەحەتی ئێوەی بەڕێزی تێدایە. بەم بڕیارە خەڵکانێ کە چاویان بە تەخت و تاجی شاهانە هەڵنایە و ناشتوانن بە هیچ شێوەیێ دەری ببڕن و تەنانەت لە گریان و هەنیسکدانیش بە دوور کراون، بە شێنەیی و وردە وردە، لە ناخەوە دەپروێن و دادەڕمێن، ئەمەش وادەکا؛ بێ ئەوەی ئێمە ڕاستەوخۆ، هەوڵی لە ناو بردنی نەیارەکانمان بدەین، بپووکێنەوە و بە ئارامی بفەوتێن و لە ناو بچن.

دەگێڕنەوە شا، کە بە گوێی دڵ، سەرنجی وەڵامەکەی وەزیری دەدا، کتوپڕ لە جێگەکەی ڕادەپەڕێ و ئامبازی وەزیر دەبێ و سێ جار ناو دەمی ماچ دەکا، دواتر بیری کەوتبووەوە کە؛ خودا بۆیە یەکێ لە براکانی بە کەڕ و کوێری هێناوەتە سەر دونیا و لە پەنا گوێیا و لە کۆشکی شاهانەدا جێگیری کردووە تا ئەم تێیبفکرێ، بەردەوامیش سەرکۆنەی خۆی کردووە کە بۆ تا هەنووکە و دەرچوونی ئەم بڕیارە و ڕوونکردنەوەکەی وەزیر، هەست و فامی بەم دیاردەیە نەکردووە و پێی نەزانیوە. پاشان ڕۆژێ بۆ پشتگیری بڕیارەکەی وەزیر و ڕاوێژکاری یەکەمی شاهانە لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا کە تەنیا بۆ ئەم مەبەستە پێکهاتبوو، بە شێوەیەکی ڕەسمی بڕیارەکەی وەزیر دەکاتە یاسایەکی نیشتمانی و ئێستاشی لە گەڵدابێ؛ بووەتە نەریتێکی

شـــاهانه و جیل به جیل لەم شانشینەدا به توندترین شێواز ڕەچاو کراوە. لەو کاتەوە مەگەر بە ڕێکەوت، دوای ئەوەی ژمارەیەکی کەم بە هۆی لووت بەربوونەوە و ماســـین وســـوور هەڵگەڕانی، کەپوویان لە دەســـت دا و کەوتنە زیندان و حوکمی هەتاهەتاییان بە ســـەرا بڕدرا، چیتر زۆربەی نێزیک بە تەواوی خەڵك، گریان و هەنیســـکدانیان لە بیر بردەوەتەوە و بە دەگمەن دەتوانرێ؛ لووت ماســـیوێ لەم شانشینەدا بدۆزیتەوە، کەچی ئەم ئازارە بە سوێیە لە مێژ ســـاڵە لە دڵی مندا نەمردووە و پەنگی خواردوەتەوە، بەڵام ســـەد مەخابن، ترسێ ڕێگرمە و چاوەکانیشم وشکارۆن و تامی سوێری فرمێســـکیان لە بیر چووەتەوە. سەد خۆزگەش بە باوکە ئادەم و دایکە حەوا، بەبێ ئەوەی ترسیان لە هەڵکەندنی کەپوویان بووبێ تاوێ بە قاقاوە بوون و تاوێکیش بە گوڕ و بە لێزمە و بە ئاشکرا گۆناکانیان بە بارانی فرمێسک خەملاندووە ...

# بڕیار

■

... تەنیا و چاوەڕوان و سەرلێشـــێواو، لە سەر چوارپایەیێکی گوڵمیخکراودا، چەشـــنی ڕەگەی دار گوێزێ، کە نیوەی لەشی لـــە ژێر خاکرا دەرکەوتووە، لەوپەڕی ڕووبەرێکی چیمەندا و ڕوو بە دەرگەی جام ڕەشـــی ئۆتۆماتیکی ســـالۆنی فڕۆکەخانەکە، چوارمیلکەم داوە. دەڵێی؛ تاقە دارێکی چەماوەی بە ساڵاچووم، هەزاران ساڵە تەمەنم. بێ جووڵە و بێ سرتە، سەرپۆپ و پەلەکانیشم نوشتاونەتەوە وچەناگەیان بە ئەژنۆکانمەوە نووساندووە، تا ئێستاش بڕیاری سەفەرێکم نەداوە، نەک توانای سەفەرم نەبووبێ، بوومە، بەڵام دڵم ســـاغ نەبووەتەوە. دڵەراوکێمە و شوێنەکەم بۆ دەستیشان نەکراوە، وابڕیارە ئەمڕۆ، دوابڕیار بدەم و خۆم یەکلایی بکەمەوە. زۆرجـــار کەوتوومەتە بەر تەوس و توانجی هاوەڵەکانم. زۆربەیان، چەندین جار چوونەتە ســـەفەر و گەڕاونەتـــەوە و کە منیان لێرە بینیووەتەوە، پێش ئەوەی زمانیان بگەڕێ، لە دووررڕاو بە تەوسەوە، زەردەخەنەیەکیـــان هەنارده کردووم. یەکیـــان ئەوەتانێ، دیارە لە

سەفەر گەڕاوەتەوە، هیلاک و ماندوو، تۆزاوی و سەرویەرگ شێواو. دەست و پێ سپی، دەڵێی؛ بە گەچی قوتابخانە، لە سەر تەختە ڕەشەکە، سەر لە نوێ نیگارکێشیت کردووەتەوە. گومانم نییە جانتاکەی پڕە لە دیاری و شتومەک. قورس دیارە و بە زەحمەت وەدووی خۆیدا ڕایدەکێشێ:

- سەفەر سلامەت، کاکە چیا!

- ئەوە هەر لێرەی بابان خراو!

- ئەزەل و ئەبەدم لە یاد بردووەتەوە و نابینی لە جیا سەفەر، دڵم بەم سمێڵانە خۆش کردووە؟!

پیاوی چابە کوڕە! بەوە دەڵێی سمێڵ، یان دەسکە کەوەر!

هـا.. بیانگرە، ئەم کتێبانەیان بە دیاری بۆ ناردووی؛ هەزار تونێکانی بۆرخێس، سەد ساڵ تەنیایی مارکیز، ... فۆئێنتێس و یوپاز و خووسێ مارتی و... پێم گوتبوون؛ هاوەڵێکم هەیە، هەمیشە تەنیا و چاوەڕوان و سەرلێشواو، لە ڕووبەڕووی سالۆنی فرۆکەخانەدا و لە سەر چوارپاییەکی گوڵمیخکراودا، تەمای سەفەری هەیە و تا هەنووکەش دڵی ساغ نەبووەتەوە بەرەو کوێ بڕوا. ئەوانیش بە تێکڕایی گوتیان: ئەمانە خەریتەی سەفەرن، بیان بە بۆهاوەڵەکەت، بەشکم ڕووە و دالانی زەمەن و بە سواری کیسەڵێکی باڵدار بهاژووێ!

لە دیارییەکانیرا، لێت ڕوونە؛ ڤیزای سەفەرەکەی ئاراستەی بەرە و کام مەملەکەتە بووە. پاش هەواڵپرسینێکی کورت، لێت

دوور کەوتەوە و بوو بە تارماییەک و بە تەوژمێکی لێڵدا ڕۆچووە گەرووی زەمەنەوە. بەڵام هەستت کرد بۆن و بەرامەی پیپی تەنیاییەکەی جێما. لە بۆنی تەقینەوەی هەوڵ سەرچاوەی هەسارەکەمان دەچێ. نێزیک لە بێ و بۆنی باڕووتی چرکەی چەخماخەی تفەنگی ڕاوچییێ لە کاتی هەوازەنیدا، لەوانەیە بەم زووانەش نەڕەوێتەوە. بۆن بە بەرگ و لاپەڕەی کتێبەکانیانەوە دەکەی، قامکت لە سەر لاپەڕەکان، بە کاوەخۆ دەبزوێنی و چەشنی سەگورگێ؛ لمۆزی لێ دەخشێنی. خۆیەتی، بۆنی جگەرە بەلگە قاوەییەکانی کوویا. ئەستوورەکەیان دەنێیتە بەر سووکە هێزێکی ددانەکانت و بە تامەزرۆییەوە دایدەگیرسێنی و ڕوومالی شەپکەکەت دەنێیتە پاشە سەرت و لاق دەخەیتە سەر لاقت. لە سەد ساڵ تەنیاییدا، نووقم دەبی. گیرسانەوەت نییە و دەڕۆی بەرە و ناخی هەزاران ساڵی تەنیاییش. ئەسڵەن دەبێ بە دەزگیرانت و پێکەوە دەچنە سەر ڕووبەڕێکی سەهۆڵبەستووی بەربەرین و وەجووتە دەکەونە سەما. لە گەرووی گوڵە وەنەوشەی گرامێکەوە؛ ژەنینێ دێتە گوێ. دەڵێی؛ لە ئەزەلەوە ساحێب دەزگیرانی. دەڵێی؛ پێکەوە، هەزاران ساڵە مەشقی سەما دەکەن، چەشنی توانەوەی گۆشتی دوو مۆمی هەڵایساو، لە نێو یەکدا دەتوێنەوە... دواتر، بە شەقام و کۆڵانەکانی تەنیاییدا دەکەویتە شوێن پێی؛ گابریل گارسیا مارکیز. لاپەڕە بە لاپەڕە و لۆ بە لۆ. دەنیشێیتە نێو گالیسکەی خەیاڵ و بە پەیژەی دووکەڵی بۆنداری

تەنباکووی جگەرە بەڵگەکەدا هەڵدەزنێی...

- «فرۆکەی جۆری تۆپۆلۆف، کاتژمێر ١٢ی پێش نیوەڕۆ، بە کاتی ناوەندی ڕۆژهەڵاتی ناوین، لە شـــاری مۆســـکۆڕا، تا پێنج خوولەکێ دیکە دێتە نیشتن!»

بـــە دەم بانگەوازەکەڕا، لە گالیســـکەکەوە بـــەر دەبمەوە و دەکەومەوە سەر چوارپایە گوڵمیخکراوەکە. ژاوەژاو و هەراهەرای ســـەفەرە. جارناجارێ و بە بێ کۆکە و بەدەم باوە و بە دەنگێکی زیکەداری ژنانەوە، چەشـــنی بێچووە مەیموونێک کە لە پشـــتە ملمەوە ئامبازی ســـەر و کوێلاکم بێ و بە مســـتە کۆڵە بەربێتە کاسەسەرم، سەرلەنوێ دەمهێنێتەوە سەر جێی یەکەم و دەمخاتەوە بیری سەفەر. تاکوو ئێستاش نەمتوانیوە بۆ ئەو سەفەرە، شوێنەکەم دەستنیشان بکەم، ئەوەش وام لێدەکا بە دەنگە زیکەدارەکەی ئەم ژنە کەڵەباب سیفەتە، تەواوی مووی لەشم، قنج و قرژ ببنەوە. دووبارە ڤیزەی نیگام دێ. دەڕوا و لە سەر جانتای کۆڵی کیژەڕێبوارێ ئۆقرە دەگرێت. بە موبایلەکـــەی و بەدەم ڕێوە؛ نوقمی چێتە. لە سەر شاشەکەی هاتووە:

«داواکارییەک بۆ سەرجەم ڕدێن دار و بێ ڕدێنەکانی دونیا؛ ســـەرجەمی پێتەختەکانم تێکەوەدا، لە مێترۆکاندا هەڵمیزتووە، بوومەتە کەڕەناژەنی ســـەکۆی پاپـــۆڕەکان، خەونووچکەم پێ نەمـــاوە بۆ فرۆکەیەکی تر، بە هەڵۆیی لـــە کلیمانجارووداا بێ نێچییر ماومەتەوە، قەبرە کۆنە بە سالاچووەکانیشم گۆڕەوشارداوە،

مەخابن مام بەختەوەرم بزر کـــردووە، نەمدۆزیوەتەوە. تکایە؛ هەر ڕدێن داریێ، لە هەر شـــوێنێکی ئاســـماندا و هەربێ ڕدێنێکیش، لە هەر شـــوێنێکی زەویدا، وەبەر چاوتان کەوت، بەم ناونیشانەی خوارەوە، ئیمەیلێکم بۆ هەنارده بکەن.

بە سپاسەوە؛ برازا وێڵەکەی مام بەختەوەر...»

ئانتوان چیخـــۆف نییە! نازانم، ڕەنگە ئەویش بێ. ئەوەتانێ، نەمگوت:

ـ «چاوەڕوانی، مرۆڤ تووشـــی دەستەوەستانی و شپرێوی دەکا. وزەی دیدەکانـــی دەبا و بە لەوەڕیش ســـەر وڕێنە و باو و بالۆرەی دەخا.»

بە چاویلکە بەنداره گردەکانیڕا، بە ڕیش و سمێڵە درشتە ماش و برینجیەکانی و کاتژمێـــره گیرفانییەکەیڕا، گومانم نامێنێ. جانتاکەی بە دەستی ڕاستی هەڵگرتووە. ڕوو لە منە و بزەیەکی تەوساوی سیمای لە قەرینە ترازاندووە. هەنگاوەکانی ڕەنجدەرانەن و دەڵێـــی گوڵمیخن بە زەویدا دەکوترێن. پاپیۆنە ڕەشـــەکەی لە قایمیان، ڕەگی لاملی ماساندووە. فریای خۆ کۆکردنەوە ناکەوم. بە هێما دەڵێ:

ـ «ئەمانەتیم پێیە»

دوا دانانی، ڕادەبووری و دەمـــی مـــنیش دەبێتە تەڵەی تەقیو.

«ئەو عاشقی مەرگە.. بووریس ئاکونین، ڕۆحە زیندووکان.. دیمێتری بایکۆڤ، ٢٠١٧.. ئوولگا ئوسلاونیکوا، مێترۆی٢٠٣٣..

دیمێتری گلۆخۆفسکی و کڵاوی ترسی ڤیکتۆر پۆلوین»ە ئەمانەتیەکەی. لە پارچەکاغەزێکدا، لە سەرووی کتێبەکانەوە نووسراوە؛ ئەمانە خەریتەی سەفەرن، بیان بە بۆهاوەڵەکەت، بەشکم ڕووە و دالانی زەمەن و بە سواری کیسەڵێکی باڵدار بهاژووێ.

لێت دوور کەوتەوە و بوو بە تارماییەک و بە تەوژمێکی لێڵدا ڕۆچووەوە گەرووی زەمەنەوە. بەڵام هەستت کرد؛ بۆن و بەرامەی پێپی تەنیاییەکەی جێما. لە بۆنی تەقینەوەی هەوەڵ سەرچاوەی هەسارەکەمان دەچێ. نێزیک لە بێ و بۆنی باڕووتی چرکەی چەخماخەی تفەنگی ڕاوچییێ، لە کاتی هەوازەنیدا. لەوانەیە بەم زووانەش نەڕەوێتەوە.

دەڕوانیتە خەریتەکان؛ ڕێگاوبانەکان، تابلۆی سەردووکانەکان، ئێتیکێتی مرووەکان، ڕێنوێنی سەر شەقامەکان، کۆڵانەکان، تەنانەت چوارچێوەی داری قەنەفەکان؛ تووسکای ڕووسە. هەویری کاغەزی کتێبەکان؛ سەرفی ڕووسە... چاویلکەکەت دەکەیتە چاوت. دەبیتە زەرگەتەیەک و بە وشەکانەوە نەدەیت. پیتەکانیش بەدەر ناکەیت. ماندوو نابی. هەدا نادەی. لە وشەیێ دەگەڕێیت؛ کەوییە و خۆماڵییە. لە شوێنگەیێ دەگەڕێی؛ لە دڵ و ڕۆحتدایە. لە سەر پانتایی نەخشەی ڕووسیەڕا بۆ شارێکی بچووک دەگەڕێی؛ پێشینیان و مێژوو وانان، ناویان ناوە:

«هەڵەبجە...!»

ڕەنگە ئەم گەڕانە دژوار و لە هەمان کاتدا بێ ئاکامە بێت کە دەتوانێ بە جۆرێک براکوژی، ناکۆکییەکانی مرۆڤ لەگەڵ خودا و نەفرەت لە بێ عەداڵەتی پاساو بداتەوە و ئەو ئیزنە بە مرۆڤ بدات کە بەردەوام لە گەڵیاندا بژیت،... ژیانێکی ئازاراوی، کە لە گەڵیا بیرکردنەوەیەکی ئەبەدی و ئەزەلیش ڕێ دەکا. گەڕانی نووسەر لێرەدا خوێنەر بیری ئەفسانەی سیزیف دەخاتەوە. بەڵام بەو جیاوازییەوە کە کۆی کاراکتێرەکان لێرەدا نە تەنیا لە ڕێگای کردەوە، بەڵکو لە ڕێگای وشەیشەوە ڕاستەوخۆ پەیامێکی خەمناک بۆ نەوەکانی داهاتوو بەجێدێڵن. پەیامی نەگەڕان و مل کەجکردن لە ئاست شکستی ئەوانەی ڕابردوو و پەلکێشکردنی بۆ ئیستا وەک تەنیا ڕاستیی ژیان و بوون ...

دیزاین: ئازاد سورخی




ISBN:978-600-5647-48-8




قیمەت: ٥٠٠٠ تمەن